رۆمان

# سەعید زەبۆکی لای خۆمان




کەمال سەعدی

پێشکێشه به:

شاسوارانی ئه ده ب و ڕێبازی کوردایه تی

* نه مر  عه ره بی شه مۆ

* نه مر هه ژار موکریانی

# سەعید و سەرەتای ناسین

دوای بیست ساڵ وەزیفە ئینجا باوکم توانی چەند عانەیەکە پێکەوە بنێتە و پارچە عەردێکە لە دوورەوەی شار ، کە گەرەکی موفتی پێ دەڵێن بکرێتەو بەقەرزو فەرز چوار چاوە خانوی ڕۆژهەڵاتی لێ دروست بکات ، تا ئەوکاتەش ئەو ناوە هەر دەکرایە کەنم و جۆ . ماڵی ئێمەو چەند کەسانێکی کەمی لێ بوو . یەکێ یان ڕەفیقی چایەچی بوو ، پیاوێکی ئێسکە سووکەو قسەخۆشەو خوێن شیرین و دۆغری بوو .

چایخانەیەکی بچکۆلانەی لەناو شار هەبوو ، هەر لە تاریکە و ڕۆنی بەیانی یانەوە دەردەچوو تاکو ڕۆژئاوابوون نەدەگەڕاوە . ئەوانیش ماڵ بەماڵ ئێمەی بەسەر دەکردەوە . زۆر حەزی لە قسەی خۆش و گاڵتەوگەپ بوو . ژیانی ئێمە لە هی لادێی دەکرد چونکی شاو کارەبامان نەبوو ... ماڵەکانیش هەریەکەیان لە پەرکەیەکی گەرەکە بوون ، هیچی یان لەیەکە نزیکە نەبوون . سەرجەم گەرەکی موفتی لە ماڵی ئێمەو ڕەفیقی چایەچی و ڕەحمان سەروپێ و عەبدول- ڕەحمانی پینەدۆزو حاجی حوسێن و سەعید زەبۆکە پێکە هاتبوو .

سەعید زەبۆکە پیاوێکی کەڵەگەتی وورگە گەورەی چوار شانەی بەخۆوە بوو . هەر بۆیەش بە سەعید زەبۆکە ناوی دەرکردبوو ، چونکی هەموو لەشی ئۆیین بوو .

هەموو ئەوێکە ڕەفیقی چایەچی بەخۆی و فانۆسەوە لێمان بەژوور دەکەوتە . سەرەتای قسەکردنی بەناوی سەعید زەبۆکە دەستە پێ دەکرد . ئێمە ئەوکاتە منداڵ بووین ، تازە یەکەم ساڵ بوو چووبووینە پۆلی یەکی ناوەندی . ئەوەندەیان باسی ئەو سەعید زەبۆکە لە ماڵی ئێمە کردبوو تا وای لێ هاتبوو شوێنی گشتی ناوێکی لەناو مێشکم پڕ کردبۆوە . چی خراپ بوو لێ یان دەگێڕاوە . لە فێڵ و تەڵەکەبازی و قوڵ بڕین و درۆزنی و ساختەچی یاتی و لە خوا نەترسی و دەستەپیسی و بێ ووژدانی و هەرچی ڕەوشتی خراپ بوو کە خوا دایناببێتە دەیان دایە پاڵی . زۆرم بەلاوە سەیر بوو

کە تەنیا دراوسێ یەکە لێی ڕازی نەبوو . خۆ هەر لەمەنکەوە
دەمویست شتێکی لێ بزانم . بەڵام باوکم ئەوەندە زوو زوو هەڵی
دەستاندم و زۆر بەتەکلیفە بوو بۆیە جارێکە نەبوو بە تەواوی
سەربردەیەکیم بەرکوێ بکەوێ . دەتووتە دەورەکانی یان لە
مابەینی خۆیان بەرامبەر سەعید زەبۆکە دابەش کردووە .
ڕەفیقی چایەچی دەوری تەنیا ناوهینانی ئەم پیاوە بوو . خۆ هیشتان
باسی لێوە نەدەکرد کە ڕەحمان سەروپێ دەی قۆستەوەو چەند
فڕوفێڵێی لێی بیستبوو هەموو ئەوێکە وەکو بنیشتە خۆشە
دەی جووی یەوە .
حاجی حوسێنیش دوای تەواو بوونی هەموو سەربردەکانی ، کەهیچی
نوێ نەدەما لێی باس بکەن ، سەری خۆی دەلەقاندو دەیووت ! شەیتان
بە نەعلەت بێت لەگەڵ ئەویش ! توخوا بەسی بکەن ، با گوناهە-
کانی کەم نەبێتەوە . دەڵێن شەیتان ، بەڵام خۆ ئەو مردوو
نەمرە لەویشی ڕەت کردووە !! سەعید زەبۆکە تێکەڵی کۆڕی ئەوانەی
گەرەکە نەدەبوو . بە ڕۆژیش بەکاری خۆی یەوە خەریکە بوو .
ئەگەر ئیشێکی زۆر گرینگە یان شوێنێکی لەبن سەر نەبایە ئەوا
بەلای ئەهلی گەڕەکەکەدا نەدەهات . بۆیە هەرکاتێکە بەرەولای
خەڵکی گەڕەکەکەمان بهاتبا هەر لە دوورەوە نەعلەتی یان بۆی
ڕەوان دەکردو دەیان ووت :
- یاساتر دەبێ ئەوجارەیان چی لەژێر سەربێت !! ئەوەی زۆر
سەرنجی ڕاکێشابووم . بێ دەنگی وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز
بوو لەناو ئەم کۆڕانەدا . وەستا عەبدول رەحمان پێشتر شاگردی
سەعید زەبۆکە بوو . هەر لە دەمێکەوە لەلای ئەو ئیشی پینەدۆزی و
کلاش دروستە کردنی دەکرد . پیاوێکی کڕو بێ دەنگە بوو . کە لە
کۆڕ دادەنیشتە بەس گوێی دەگرت و هیچ قسەی نەدەکرد . کە باسیش
دەهاتە سەر باسی سەعید زەبۆکە پەنجەی خۆی دەکەستەوەو سەری
لەگەڵ دەلەقاندو دەیووت :

- من سووچی خۆم بوو ، دەبایە هەر لە ئیشەکانی بم ناسیبا !!
رەفیقی چاپەچیش لە قاقای پێکەنینی دەداو دەیووت :
- خوا خێرت بنووسێت ، خۆ ئەگەر ئەتوش نەبایت ئێمەش حاڵمان لە دەست ئەم کەڵەکە چی یە لە تۆ باشتر نەدەبوو ! هەر هەمووومانی هەراج دەکرد . وای لێ هاتبوو وەکو قەوان هەموو شەوێک هەمان تاس و حەمام دووبارە دەبۆوە .

ئێوارەیەکیان خەڵکی گەڕەکە لەناو باخچەکەی ئێمە کۆبووبوونەوەو باسی ئەم دونیایەیان دەکرد ، سەعید زەبۆکە بەژوور کەوت و پارچە کاغەزێکی سپی و ئەستەمپەیەکی مۆرکردنی بە دەستەوەبوو . هەر لە دوورەوە بە پێکەنین ووتی : چتان دەوێ ئەوا پارەی موختاریشتان لە کۆڵ دەکەمەوە !! هەموویان واقیان وڕما و ڕوویان لەیەک کردو بە سەرسامی یەوە بە یەکیان ووت :
ئەمەش ئۆینێکی ترە !!
وەرەقەکەی لەسەر مێز داناو پێش هەموو شتێک هاتە سەر باسی موختارو پیشەوی و پەیوەندی بە خەڵکەوەو سوودەکانی بۆ گەڕەکە . تا ئەو کاتە نەمدەزانی پێناسەی موختار چی یە ، دەتووت بەبەغایە هەر لەپێناسەی موختارەوە تا دەگاتە بچوکترین وەزیفەی موختاری لەو کوڕەدا شەرح کرد . دوای ئەوە هاتە سەر لایەنی دارایی یەوە ووتی :
- میللەت هەژارە و پێویستی بە یارمەتی هەیە . ئەو موختارانە زۆر بێ ویژدانن ، بۆ هەر کارێک بچیتە لایان مۆرێکت بۆ ناکەن هەتا نیودیناری یان پێنجەکی نەدەیتێ . ئاخر ناڵێن بەم نیودینارە مرۆڤ ڕۆژێک دەژیێت .
زیاتر هاتە پێشەوەو ڕووی لەڕەفیقی چاپەچی کردو ووتی! وانی یە کاکە ڕەفیقە ؟ کێ بێت لەئێمە ئیشی بە موختار نەکەوێتە بۆ ناو نووس کردن یان دامەزراندنی منداڵەکانمان بکرە بۆ وەرگرتنی دەفتەری خزمەتی سەربازی و ژن هێنان و مردن نامەو دەرهێنانی وەکالەتی بازرگانی و چوونە دەرەوەی وڵاتەو دامەزران لە

دايەرەكانى دەوڵەت و هەزاران شتى تر . دەتۆ وەرە ئەم هەموو ئيودينارى ياتە كۆبكەرەوە بزانە چ سامانێكى زۆرى لێ پێك دێت .
هەموويان بەيەك دەنگ ووتيان :
- ئەئەدو بيلد ڕاست دەكات .
ڕەحمان سەروپێ ووتى :
- هەر ئەمڕۆ من ئيودينارم داوەتە مام فەتحى موختارمان بۆ جێ بەجێ كردنى دەفتەرى خزمەتى سەربازيى كوڕەكەم .
ڕەفيقى چايەچيش بە پێكەنينەوە ووتى :
ئەى بۆ من نالێى يەك تاقە دينارى ڕەبەقم داوەتە ئەو لەبرسان مردووە ، چى يە ئيجازەى دوكانم بۆ دەربێنێ .
باوكيشم ووتى :
- بۆ من نالێن ، سالْ نى يە ڕێم نەكەوێتە لاى موختارو ئيودينارم لێ وەرنەگرێ .
سەعيدە ڕيوى بەم لايەن گيريە كەيف خۆش بوو ، لەخوشى ياندا هەر ئەوەبوو ، بالى نەدەگرت و نەدەفڕى ، بەپێكەنينەوە ووتى :
- چى دەلێن من ئەم ئيودينارەتان لە كۆلْ بكەمەوەو هەتاهەتايەش نەخوتان و نە منالەكانيشتان فلسێكى سوور نەدەنە موختارو هەموو كارێكشتان وەكو تەلقە تەواو بێت ؟!
هەموو بەيەك دەنگ ووتى يان :
- كێ هەيە ئەمەى بەلاوە ناخۆش بێت .
ڕەفيقى چايەچى سەرى خستە ژير گوێى باوكم و چرپەيەكى كرد .
ئەويش بە دەورى خۆى چرپەيەكى لەژێر گوێى ڕەحمان سەروپێ كرد .
وەستا عەبدول ڕەحمانى پينەدۆزيش تەماشاى هەموويانى كردو هيچ قسەى نەكرد بەس پێكەنى .
سەعيد زەبۆكە شتەمبەكەى هێنا پێشەوەو لەبەرچاوى ئەوان پەنجەى خۆى پێدا هێناو مۆرێكى گەورەى لە ئەرەوەى وەرەقەكە كردو ووتى :

- هیچ مەترسێن ، شکی هیچ مەکەن ، وا من مۆرم کرد ئێوەش ناوی خوای لێ بێنن و مۆری بکەن ، هەر هەفتەیەکی تر ەو دەبمە موختاری گەڕەکەو هەموو ئیشێکتان بە خۆڕایی مەیسەر دەبێ . پێویست ناکات ئێوە بە دوای موختاردا بکەرێن ، من خۆم هەموو ئیوارەیەکە سەر بەماڵی هەمووتان دادەگرم و هەر کارێکتان هەبێ بۆتان دەکەم . ئەگەر سەفەریش بکەم پێشتر مۆرەکە دەدەمە دەست یەکێک لەئێوە .

وا پێدەچوو هەموویان لە سەعید زەیۆکە چاوترسای بووبن ، بۆیە کەسی یان جورئەتی ئەوەی نەدەکرد پەنجەی پێوەنی .

ڕەفیقی چا یەچی بەکاڵتەوە ووتی !

- دەترسم سەعید حزبێکمان لێ دروست بکات و سەرمان بکاتە بەژێر قنارەوە .

ڕەحمان سەروپێ ووتی !

- خۆ شتێکی زەحمەت نی یە ، با یەکێک بۆمان بخوینێتەوە وبزانین چی تیا نووسراوە ، ئەوجا پەنجەی پێوەدەنێین .

لەمن زیاتر کەسی خوێندەوار لە ماڵەوە نەبوو . بانگی یان کردم و لیستەکەیان دایە دەستم ، منیش ووردو درشت بۆیا نم خوێندەوە . بستێکی بەقسەی قەڵەوو درۆو دەلەسە پڕکردبۆوە ، دوای ئەویش کۆمەلێک ناوی لەدوای یەکە ڕیز کردبوون گوایا دانیشتووی گەڕەکی موفتین ، لە حەقیقەتدا فریان بە گەرەکەکەی ئێمەوە نەبوو . ڕەفیقی چا یەچی رووی لە دانیشتوان کردو بە پێکەنینەوە ووتی!

- من هیچ سەرم لەکاری ئەم سەعیدە دەرناچێ . سەرێکی هەیەو سەد سەودا ، دەترسم بۆ ردێن بچین و سمێڵیشی لەسەر دابنێین!!

ڕەحمان سەروپێ بە پێکەنینەوە ووتی !

- قەت ئێمە لەم سەعیدە تەمبێ خواردی نابین ، ئەها !! ئەگەر ردێنی لە کوو وەرنەدایین !

باوكیشم ڕووی لە وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز كردو ووتی :
- تۆ دەڵێی چی وەستا عەبدول ڕەحمان ؟
وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز هەروەكو جاران پەنجەی خستەوە ناو دەمی و ووتی :
- من پەنجەی خۆم گەستۆتەوە ، تۆبە ! بەهاوینان پانكە بە زستانان سۆبە ! ئەگەر ئەم سەعیدە پەیامیشی بۆ بێتە خوار نە بە قسەی دەكەم و نە تخونیشی دەكەوم . هێشتان برینی كۆنم ساڕێژ نەبووە جا ئەورەی برینێكی ترە .
ڕەفیقی چایەچی ڕووی لە وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز كردو بەگاڵتە پێی ووت توخوا ئەگەر بۆمان نەگێڕیتەوە چۆن سەعید فێڵی لێ كردیت ؟!
وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدوز سەری خۆی لەقاندو ووتی :
- شەیتان بە نەعلەت بێت . ڕەجای خواتە لێ دەكەم ڕەفیق بەسی كەو بی برێنەوە با چی تر برینم نەكولێتەوە .
سەعیدە ریوی لەقسەكانی ڕەفیقی چایەچی قەڵس بوو . بەتووڕەیی هەستا ، وویستی بچێتە دەرەوە ووتی :
- مردیت مرێ وەكی بنیشتە خۆشە ئەم قسەیەت هەر لەسەر زارە ، بوو بە حیكایەتی عەنتەر هەر نەبڕایەوە ، كابرا دەنگە ناكات تۆ چیتە ؟!
ڕەحمان سەروپێ و باوكیشم خۆیان دایە پاڵ ڕەفیقی چایەچی و بەوە سویندو بەوە تكا ئاخیری وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆزی یان هێنا قسەو كۆنەكای چەند ساڵەیان پێی بەبا كرد . منیش گوێم قولاخ كردبوو ، زۆر تامەزرۆی سەربردەی ئەم سەعیدە بووم.
وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز ڕووی لەدانیشتوان كردو ووتی :
- بۆچی دەمم دەكەنەوە ؟ ئەی بەخۆتان لەمن باشتر ئاگادار نەبوون كە چۆن لەخشتەی بردم و بەپارەو پوولی من خانوەكەی خۆی تەواوكرد . منی بە دوكان بەستبووەوەو بەناوی پیاوەتی

گوایە هەر لەگەڵ دەستی خۆی خانووەکەی منیش سەرپەرشتی دەکات و ئاودان و هێنانی کرێکارو کڕینی کەرەستەکەشیم لەکۆڵ دەکاتەوە . من بەچی بزانم ، ئەم حەرام خۆرە لەخوا ناترسێ و خانووەکەی خۆشی بەکەرەستەی من بەرز دەکاتەوەو ڕۆژانەی کرێکارەکانیشی لەسەر من حیساب دەکات . گلەیی لەو ناکەم ، خەتای خۆم بوو ، ئەگینا کێ هەیە تاکو خانووەکەی تەواو دەبێت سەرێکی لێ نەدات ؟ کەسیشم نەدۆزی یەوە ئەو نەبێت و خانووم لەتەنیشتی دروست کرد !

ڕەفیقی چا یەچی بە پێکەنینەوە ووتی!

ـ ئەدی ئێستا بۆچی هەر لەتەنیشتی مایەوەو خانووەکەت نەفرۆشت ؟ دیارە لەوە ناترسێی پەندێکی ترت پێ بکات ؟ وەستا عەبدول ـ ڕەحمانی پینەدۆز سەری خۆی لەقاندو ووتی :

ـ ئەگەر لەدەستم دەهات ، هەر لەوکاتەی کەزانیم خیانەتی لێی کردوومە ، لە دراوسێ یەتی بەدوور دەکەوتمەوە . بەڵام شاخ دەستی ئێوەم شکاوە ، ئەو دەمەشڕەی ئێوە هەموو شتێکی لێ تێک داوم . سەربردەی ئەم پیاوەتان کردۆتە حیکایەتی مەلای مەشهورو کەس نەماوە لەم شارەدا بە فڕوفێڵ و کەڵەکاتی سەعیدی نەزانیبێ. بۆیە هەر کڕیارێکی دەیهێنمە سەر خانووەکەم لەبەر سەعید عانەیەکی قەڵپی پێ نادات .

سەعید زەبۆکە لێی هاتە پێشەوەو ئەم لاو ئەو لای ڕومەتەکانی وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆزی ماچ کردو دەستی خستە سەر شانی و ووتی :

ـ گوێ لە قسەی ئەمانە مەگرە ، هەر ئەوان بوون بەینی من و تویان تێکە دا ، ئەگینا فەرقی من و تۆ چی یە ، هەردووکمان برای دینێکین ، خۆماڵمان لەگەڵ یەکە بەش نەکردووە . بەشەرەفم ، بە نامووسم ئەم موووە لەپیاوان نەهاتبێ ئەگەر ڕۆژێکە لەڕۆژان کیسە جیاییم لەگەڵ تۆ کردبێتە . ئەگەر برای خۆم دراوسێم بوایە

ئەر ئەوەندە کەیفم پێی دەهات و بەپێی فەرموودەی پێغەمبەریش میراتی دراوسێ بۆ دراوسێ دەبێ ئەگەر کەسوی نەبوو ، من لـە تۆ زیاتر کێ شک دەبەم ، بەنا شوکری نالێم برام هەیـە ، مامم و خاڵـم کەسوکارم هەیە . ئێستاش ئەوەی چوو چـوو ، با هیچی تر لە دوو چوان نەچین .

وەرەقەکەی هێنا بەردەمی وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆزو بـە پێکەنینەوە پێی ووت :

- شەیتان بە نەعلەتەکەو پەنجەیەکی پیوەنێ . دەوەڵێ مادام وەی لێ هات تۆ دەکەمە جێگری خۆم و گەردەنیشت ئازاد بێت ئەگەر من لێرە نەبووم هەر لەفلسێکەوە هەتا هەزار دینار بۆ خـۆت بێت و وەکو ئاوی حەیات لێت حەلاڵ بێتە .

وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز وەرەقەکەی بە تووڕەیی فڕێ دایـە ئەم لاو ووتی :

- بەس ئەو کڵاوە مابوو لەسەرم نێی !!

ڕەفیقی چایەچی ڕووی لەوان کردو ووتی :

- بۆ دڵـی خۆمانی لێ پیس بکەین ، ئەوە نەبوو کاغـەزەکـە خوێندرایەوە . ڕەحمانی سەروپێ ڕووی لە ڕەفیقە کردو ووتی :

- ئێوە خەریکی قسەبوون نیوەی لاپەڕەکەی هـەر نەخوێندەوە خـۆم چـاوم لێ بـوو .

ڕەفیقی چایەچی ڕووی تێ کردم و ووتی :

- جارێکی تریش کاغەزەکە بخوێنـەوە ، با هەموویان گوێ یان لـێ بێت ، بەس نەکەی هیچ بەجێ بهێڵی ؟

ئەوەبوو ئەوجارەیـان لە نوکەوە کاغەزەکەم بۆیان خـوێنـدەوەو هیچم لێی بەجێ نەهێشت ، تەنانەت ئەوەی دەشم زانی درۆیە هەر بۆیانم خوێندەوە . کاغەزەکە بریتی بوو لەسکالا یەک ناونیشانی تیایدا ڕیز کردبوو ، گوایا ئەوانە دانیشتووی گەڕەکی موفتین و داوا دەکەن گەڕەکەکەیان پەیوەندی بە گەڕەکی ئیسکان وجمهوریەوە

بپچڕێت و سەعید بکەنە موختاری گەرەکە . کۆمەڵێک ڕەوشتی باشو زیرەکی و ڕاستگۆیی و پاکیی ئەم زاتەشیان لەناو سکالاکە ڕێز کردبوو . ئەوەندەم پێکەنین بەم قسانە دەهات ، لەتاوان هەموو لێوی خۆم کرۆشتەوە . شتی وای تێدا نووسی بوو و سەر بەهەش پێکەنینی پێ دەهات . ناوە ناوەش وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆزم بیر دەکەوتەوە بۆیە هەتا تەواوم کرد هیچ شاوڕم لەلای ئەو نەداوە . لەژێرەوەی هەموو ناوەکانیش ناوی هەرپێنج دانیشتووی گەڕەکەکەمانی نووسی بوو .

ڕەفیقی چایەچی لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :

ـ جەماعەت خۆ من خوێندەواریش نیمە ، بەلام خۆ ئێوەش گوێتان لێ بوو ، ئەم هەموو ناوانەی سەعید لەناو ئەم سکالایەدا ڕیزی کردوون کوا خەڵکی گەڕەکن ؟!

ڕەحمان سەروپێ ووتی :

ـ مەگەر سەعید بزانێت ! ئێمە بەهەموومان شەش ماڵین ، ئەم مردوو نەمرە زیاتر لەسەد ناوی ڕیز کردووە ، نازانم مەبەستی چی یە ؟

سەعید زەبۆکە لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :

ـ دیارە هێشتان منتان نەناسیوە ؟! ئەگەر ئەوها نەبێ چون دەمکەنە موختاری گەڕەکە ؟!

ئەم سەعید زەبۆکە زمانی ئەوەندە لووسە ، شەیتانت بۆ لە خشتە دەبات . بەهەرحاڵ گشتی یانی ڕازی کردو مۆری پەنجەی هەموویانی وەرگرت . تەنیا وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدوز نەبێت مۆرەکەی نەکرد ووتی :

ـ سوێندەو خواردوومە بۆ بەهەشتیش لەگەڵ ئەم سەعیدە ناچم !!

# سەعید زەبۆك دەبێتە موختار

هەمووی چەند ڕۆژێکی نەبرد ، لەسەر دەرگای حەوشەکەیان بە خەتێکی درشت نووسرا بوو ، ماڵی موختاری گەڕەکی موفتی سەعید . هەر لەو ڕۆژەوە کە بووە موختاری گەڕەک بەلای ئەو ماڵەشدا نەهات . ئەوێکە ڕەفیقی چایەچی لەگەڵ خەڵکی گەڕەکەکەمان لەماڵی ئێمە کۆبوونەوەیەکی یان سازدا ، تەگبیری یان بۆ بەسەرکردنەوەی سەعید زەبۆک کردو بەپێنج قۆلی یەوە ڕوویان لەماڵەکەی کرد . دوای لەدەرگادان چوونە ژوورەوە . لەدیوەخانەکە دانیشتن وچایەیان بۆ هات و خورایەوە . تەماشای سەعیدیان دەکردو لەیەکە ڕادەمان. سەعید چاویلکەیەکی سپی تەندروستی لەچاو کردبوو و کۆمەڵێکە وەرەقەی سپی و فایلی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەردەم خۆی دانابوو و خەریکی پڕکردنەوەی کاغەزەکان بوو . ڕەفیقی چایەچی ڕووی لە سەعید کردو ووتی :

- کاکە سەعید ئاوڕێکیش لەلای ئێمە بدەوەو بزانە بۆچی هاتووین ؟

هیچ خۆی تێکە نەدا ، بەتیلی چاوی یەوە لەژێرەوەی چاویلکەکەی سەیرێکی ڕەفیقی کردو ووتی: خێربوو ؟ بۆچی هاتبوون ؟ ڕەحمان سەرەڕی ووتی :

- ئەی نازانی بۆ پیروزبایت هاتووین ، بەبۆنەی ئەوەی جەنابتان بوون بەموختاری گەڕەکەکەمان .

پێکەنی و ووتی :

- سوپاستان دەکەم بەخێربێن .

ئەوانیش مقۆمقۆیان بوو و دووایی بەچرپە لەگەڵ یەک دووان . ڕەفیقی چایەچی زۆر بێ شەرم و دەم شڕو قسە لەڕوو بوو ، ڕووی لەسەعید کردو ووتی:

- ئەوە هەر لەئێستاوە پشتمان تێ دەکەی ، ئەدی دەبێ دووایی یەکەی چۆن بێ ؟!

سەعید زەبۆک کاغەزەکانی خستەلاوەو لێ یان نزیکە کەوتەوە، بەزمانی لووسەوە ووتی :

- ئەستەغفیروڵا ، ئێوە براگەورەی منن . هەر لەو ڕۆژەی بوومەتە موختاری گەڕەک شەوو ڕۆژ بێنم نی یە ، هەر خەریکی ڕێکخستنی کاروباری گەڕەکم . ئەوا دەبینن فایلم بۆ هەمووتان کردۆتەوە .

هەندێک شانەکانی هەڵتەنکاندو بەشێم شێحمەوە ووتی:

- تا ئێستا بایەخ بەم گەڕەکەی ئێمە نەدرابوو ، هەر بۆیەش نە ئاوو نە کارەبای بۆ نەهاتووەو زستانانیش پیاو چۆڵکێک دەکەوێتە ناو قوڕو چڵپاو بەڵام خوا یاربێت هەر لەبەیانی زووتر نی یە ئەم کارانە گشتی مەیسەر دەکەم .

بەم قسە قەڵەوانە گشتی یانی تەریقە کردنەوە، ڕوویان لەیەک کردو ووتیان :

- ئەشەدو بیلا خراپی تێ گەیشتبووین ! دیارە دەیەوێ گەڕەکەکەمان بکاتە گەڕەکی بەڕاستی .

ئەو شەوەیان بە گفتوگۆکردنی پرۆژەکانی سەعیدە زیوی یەوە بەسەر برد .

# سەعید زەبۆك



چەند ڕۆژێکی نەبرد ، دایەرەی کارەبا دارتێلی کارەبای لە سەرتاپای گەڕەکەکەمان فڕێ داو ناوە ناوە بەدرێژایی شەقامەکان کرێکار بەخاکەناس و قازمەوە خەریکی کۆڵینی شوستەکان بوون . دیسان وەکو جاران خەڵکی گەڕەکە کۆبوونەوەو کەوتنە ستایشی سەعید زەبۆکە . هەریەکەی بەجۆرێکە بەشان و باڵیی هەڵدەدا ، گوایا ووردە ووردە دێ قسەکانی و پەیمان و پڕۆژەکانیی بێنەدی . بەلام وەستا عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز هەر سەری خۆی دەلەقاندو دەیووت:
- ئەم ماستە مووێکی تیایە ! سەعید ئەوکەسە نی یە دەست لەکاری خۆی هەڵگرێ و بەدووای ئیشوکاری گەڕەکە بکەوێتە . وا خاو نەپیچراوەتەوە . لەدووای کەری تۆپی لە گەڕێ تا نالەکەی لێ بکاتەوە . جا چۆن خێری لێ دەبیندرێتە . کەی تۆز لەقوڕێ دا بڵند دەبێ ؟! ئەوە بۆ هەفتەیەکە دەچێ ، وازی لەدوکانەکەی خۆی هێناوەو کەس نازانێ بەدووای چی دەگەڕێ .
ڕەفیقی چایەچیش ووتی:
- لەلای خوا دوور نی یە چاکە بووبێتەوەو گۆڕابێتە . بۆنا هەزار گونابەجو یەک تۆبە .
حاجی حوسێن بەدەنگێکی بەرز ووتی:
- ئەیتان بەنەعلەت بێتە . ئەم ئیبلیسەو تۆبەیان نەووتووە .
ئەمان لەم قسانەدا بوون ، سەعید زەبۆکە هاتەلایان و لیستەیەکی گەورەی خستنە بەردەم و ووتی:
- ئیشێکی چۆنم کردووە ؟!
هەموو بەیەکە دەنگە ووتیان :
- تازە باسمان دەکردی ، ئەشەدوبیلا ئەمەیان ئیشی تەواوە .
ئەگەر مانگە هەڵبێ حەوجە بە ئەنگوستە نی یە .
قەڵەمەکەی لەسەر باخەلی دەرهێناو دایە دەستم و ووتی :

ـ کوڕی خۆم یەکی دەدیناری یان لی بستێنەو لە بەرامبەر ناو
یان ئیشارەتی بۆ بدە ؟
لەجێی خۆیان حەپەسان ، بەسەر سوڕمانەوە ووتی یان :
ـ ئەم دەدینارە چی یە سەعید !؟
ووتی :
ـ ئەی نابینن کرێکارم لەسەر ئەرکی خۆم بۆ چەقاندنی دارتێلەکان
گرتووە ؟
هەندێک خۆیان هێناوبرد ، بەلام هیچ سوودی نەبوو ئەمری خوا
ڕەزای حەق ، بەدەدینار لەدەستی بۆ کارەبایی ڕزگاری یان بێتە
خراپە نی یە . دەستی یان بردەوە باخەڵ و یەکی دەدیناری یەکی
سووری یان وێرکرد .
چەند ڕۆژێک بەسەرچوو ، کەس بەلای دارتێلەکاندا نەهات و
تۆرتەکانیش هەروا مانەوەو منالان یاری یان لەناو دەکرد .
ڕۆژێک باوکم هەر لەسەر ڕێگای خۆی یەوە ، سەرێکی بەدایەرەی
کارەبا داگرتبوو و خۆی گەیاندبووە لای جەنابی بەڕێوەبەر و
پێی ووتبوو :
ـ تۆرتەکانتان بە ئێمە لێ داو بەم سەری مانگە بێ پارەو پوولتان
هیشتینەوە . کەچی دارتێلەکان هەر لەجێی خۆیان کەوتوون وکەس
نەهاتە بەلایانەوە .
بەڕێوەبەرلەقسەکانی باوکم سەری دەنکوڕمێ و دەڵێ :
ـ چۆن شتی وا بووە ، من بەدەستی خۆم پارەم لەمیزانی یەی
دایەرەکەمان بۆ کرێکارەکان سەرف کردووە .
هەر ئەو ڕۆژە ، باوکم بە تووڕەیی هاتەوە ماڵێ ، لە ڕقان
چاوی عەردی نەدەدیت ، پێتە لێ بدابا شەقی دەبرد ، لەو سەری
ژوورەکە بەخێرایی دەچووە ئەوسەری تری و لێوەکانی خۆی
بەقینەوە دەکرۆشتەوەو لەبەردەم خۆی دا دەیووت :
ـ ئەم سەگە بابە چاوی بەهیچ تێرنابێ ! ئەوەتا کرێکاری لەسەر
حسێبی دایەرەی کارەبا گرتووەو پارەکەش بە ئێمە دەدا . بەدەم

قسەکردنەوە چووە دەرێ و ووتی:
- هەر ئێستا تێر شەقی دەکەم ، ئێمە ئەم قورمسا غەمان کردۆتە موختاری گەڕەکی هەتا یارمەتیمان بداتە نەک ئەو پــــارەو پوولەی هەشمانە بە فێڵ وفــڕ لەباخەڵمان دەربێنی .
ئەم قسانە لەلای سەعید زەبۆکە بای دێ ، خۆی لەهەزار شــاو داوەو قاچی ئەڕنەبووە !!
هەمووی سەعاتێکی ئەبرد ، باوکم لەگەڵ سەعید زەبۆکە بەیەکــەوە بە پێکەنین هاتنە ژوورەوەو لەسەرەوەی ژوورەکە دایینــا . دوای ئەویش ڕەحمان سەروپێ و حاجی حوسێن و ڕەفیقی چایەچیش هاتنــە ژوورەوە .
بێ ئەوەی سەعید داوای پارەیان لێ بکاتە . دەستــی یــان بــۆ باخەڵی یان بــردەوەو یەکــی هەشتە دیناری کەشی یان دەرهێنــاو لەدەســتی سەعیدیان کــرد .
کــەر لەکــوێ کەوتی یەو کونده لەکــوێ دڕاوە !! کەباوکم چــووە دەرەوە دڵــم لەسەدو بیستە لــێی دەدا ، چاوەڕێی ئەوە بــــووم دەنگە لەکــولان بەرز ببێتەوەو ســەعیدو باوکم تێکە بئاڵــین و پارەی خۆی و خەڵکــی گەڕەکی پێ قــا بکاتەوە . کەچی ئەوجــارە بەدەســتی خۆی ڕایکێشا ژوورەوەو خــڵایان بۆی تالان کردە بــــۆ ڕدیێــن چــوو سمێڵیشــی لەسەر دانا .
دیسان وەکو جاری پێشوو یەکە یەکە کەوتنە ستایشی و دەیانووت :
- ئەگەر تۆ نەبیتە ئاوەکەمان نابێتە . ئەویش خۆی گران کردبــوو دەیــــووتە !
- چۆن کارەبایەکــەم بۆ هێنان ئەوهاش ئاوەکەتان بۆ دێنم .

# ئاو بۆ گەڕەك دێنێ

دوای ئەوەی خەڵکی گەڕەک یەکی هەشت دیناری تریشی یان دا سەعید زەبۆکە بۆ کریێ قۆرت لێدان و هێنانی ئاوەکە بۆ گەڕەکە. هەموو ڕۆژێکە چاوەڕوان بوون، پێ یەکی یان لەماڵەوە بوو، پێ یەکەی تری یان لەلای سەعید بوو. لەهێنانی ئاوی یان دەپرسی. ئەو جارەش یان وەکو جاری پێشوو بەبێ ئەوەی بزانن چی تیا نووسراوە، مەزبەتەکەیان بۆی مۆرکردبوو.
لەمەسەلەی کارەبایەکە باوکم دەرسی وەرگرتبوو، سیقەی بەسەعید نەمابوو کە ئیشەکە بەتەواوی و بێ فرۆفێل دەکات. بۆیە هەر زوو خۆی کەیاندە دایەرەی ئاوو لەسۆراخی مەزبەتەکەی پرسی یەوەو مەسەلەی هەشتە دینارەکەشی لە لێپرساوی ئاو پرسی بوو. قەت سەعید نەبووە قسەی ڕاستە دەرچێت. لێپرساوی ئاو بە باوکمی وتبوو لەسەر قسەی ئێمە ئەو هەشتە دینارەی لەئێوە وەرگرتووە و چونکی پارەمان نی یە کرێکارتان بۆ بگرین. ئێوەش خۆتان لەناو مەزبەتەکە ئامادەیی خوتان پێشان دابوو.
دوای چەند ڕۆژێک دەستە کرا بەعارد هەڵکۆڵین و بۆڕی یان بەناو بڵاوکردەوە.
خەڵکی گەڕەک کەیفە ساز بوون. ئەو ڕۆژە ناو هەر ناوی سەعید بوو. کێ موختاری وای لەگەڕەکەکەیدا هەیە ئێمە نەبیت؟ ئەگەر ئەو نەبوایە ئێستاش دەبا هەر یا لێلی بلێین!!
عاردەکەیان هەتا بەردەرگای ماڵی سەعید هەڵکۆڵی و بۆڕی یان تیا بڵاوکردەوە. لەوێوەش ڕێزە بەلوعەیەکی یان تۆی خست و لێوێ کەران.
خەڵکی گەڕەک سەرسام بوون. دەتووت ماڵی سەعید بۆتە مزگەوت بەس ڕێزە ئاودەستە خانەیەکی نوقوستان بوو.
ئەمەش شۆینێکی تری ئەم قورمساغە. دیسان باوکم یاغر یاغر

ڕۆیشتەوە دایەرەی ئاوو لەم بارەیەوە لێ یانی پرسی . پێ یان
ووتبوو ئێوە خۆتان واتان داواکردووە و سووچی ئێمەی تیانی یە .
بۆ زیاتر دڵنیاییش مەزبەتەکەیان پێشان دابوو .



هەرچەندە ئەم سەعیدە ، کابرایەکی ساختەچی وەکە خـــۆی نەبوو لەقۆڵ بڕی و تەڵەکەبازی و درۆزنی دا هاوتای نەبوو بـەڵام خـۆ توانی لەماوەیەکی زۆر کـەم گەڕەکەکەمان ئاوەدان بکاتەوەو ئاوو کارەباو ئەقامی قیرتاوی بـۆ ڕابکێشێت .

بۆیـە زۆرکەس لەجیاتی گەڕەکی موفـتی دەیان ووت سـەعیداوە !!

سەعید زەبۆکە کەزانـی گەڕەکەکە بەهۆ زۆری دەڕواتەو هەتـا دێت دانیشتوانی زیاد دەبێت و ئیشو کاریشیان لەبـن نایـــەتە بۆیـە لەپەیمانەکـەی پەشیمان بۆوەو دەستووورێکی بۆ ڕاپەراندنـی کارەکانی و وەرگرتنی پـارە لەخەڵکـی گەڕەکە دانا . لیستەیەکـی لە دیوەخانەکەی هەڵواسـی و تیایدا نرخی بۆ هـەر جۆرە کارێـکە دانابوو ، بەپێی جۆری کارەکەو گرنگـی و بێ بایەخی . پارەیەکی یەکجـار زۆری لەو کەسانە وەردەگرتە کە داوای ئیجازەی هێنـان و ناردنـە دەرەوەی کەل و پـەل و کڕیـن و فرۆشتنی قوماشو وەکالەتی فرۆشتنـی بیبسـی کۆلاو سیفن ئەپ و توراوبی یان دەکرد . ئـــەو کەسـەی ژنیشـی بهێنابایە دەبوایە قوتوبەکی چوکلێتی لەگـەڵ دوو دینار بۆ بباتە ماڵەوە ئەوجا مۆری بۆ لێ دەدا . تەنیـا ئـــەو مەعامەلەی کە نرخەکـەی نەگۆرابوو و هەروەکو خۆی مابـــۆوە دەرهێنانی شەهادەی مردن و لەدایک بوون بوو .

هـەزار خوزگـە بەکفن دز !! خـۆ موختاری کـۆن بـت ناسیباو نـــەتە ناسیباو هـەرچی ئیشکیشت هەبوایە هـەر ئیودینارەکەی لـــێ وەردەگـــرتی .

خەلکی گەڕەکە ڕقەو کینەیان گەیشتە سەر لێوان و وەکو بـورکـان بەڕوویدا تەقینەوەو دەنگـی ناڕەزایی یان دژی بـەرز کـــردەوەو لـەوێی نەگەڕان هەتا لەموختارەتی یان خستە .

# چۆن منو سەعید عەردمان بەیەکەوە کڕی؟

کە گەورە بووم و ژنم هێنا ، زۆر حەزم دەکرد لەژیانی سەعید زەبلۆک بکەم و لەنزیکەوە بیناسم . دوای لێ کەوتنی لە موختاریێتی ، خووی خۆی دایە خانوو دروست کردن و هەر خەریکی خانوو کردن بوو بۆ فرۆشتنەوە . زۆربەی عەردە بەتاڵەکانی گەڕەکەکەمانی کڕی بەوەو کردنی بە خانوو و بەپارەیەکی باش فرۆشتنی یەوە . مرۆڤ هەتا خانوێک دەکات بربڕەی پشتی لەگەڵ دەچەمێتەوە کەچی ئەو لەلای وەکو ئاوخواردنەوە وەها بوو ، بەلای کەمی ساڵی دووسێ خانووی تەواو دەکردو دەیفرۆشتەوە .

ئەوەندەی خانوو لەگەڕەکی موفتی دروست کردبوو هەتا وای لێهات ناوە ئەسڵی یەکەی بزرکردو بە سەعیداوە ناوبانگی دەرکرد . لەبەر ئەو عەردی بەتاڵ بەبەر دەستی کەس نەدەکەوت . وەکو خدری زیندە لەسەر هەموو عەردێکی بەتاڵ حازر بووە بۆ سەر هەر عەردێکی بەتاڵ بچوبای دەیانوت هی سەعیدەو ئەو کڕیویەتی . زۆر جاران بەخاوەنەکەیان باوەڕنەدەکردو دەیانوت عەردی سەعیدە . قوڕ بەسەری ئەوکەسەی عەردی لەگەڕەکی موفتی بوایەو لەبەر بێ پارەیی بی ویستبا بیفرۆشێتەوە ! خۆ بڵێی مردار دەکردەوەو هەتا ئەو نەی کڕیبا کەس خاوەنەکەی نەدوزی یەوە . هەر هیچ نەبا ڕۆژی یەک دوو جاران بەسەری دەکردەوەو بەپانی و درێژی یەکەی دەهاتەو دەچوو و بەفووتەو قاپیش فووتە دەی پێوا ، گوایە هی خۆیەتی و دەیەوێ بیکاتە خانووە ئەم خەڵکەش ئەوەندە دلسافەو ساویلکەو بێ غەل و غەشو خۆش باوەڕن بەهەموو شتێک باوەڕدەکەن . منیش لەبەر دووشتە دەمەویست لەگەڕەکی موفتی خانوو بکەم ، لەبەر نزیکی ماڵی باوکم و زیاتر ناسینی سەعید زەبۆکە .

ماوەیەکی زۆر گەڕام و سووڕام هیچ عەردم بەدەست نەکەوت کەبیکڕم . هەر عەردێکم دەدیتەوە دەیانوت هی سەعید زەبلۆکە .

هەرچەندی بیرم لێ دەکردەوە ، نەدەچووە ئەقڵم ئەم سەعیدە
پارەی کڕینی ئەو هەموو عەردانەی هەبووبێت ، بۆیە زیاتر لە
جاران ئومێدم پەیدا دەکردو بەسەر هەموویاندا دەسورامەوە .
چەند جارێک بەسەعیدم ووت ئەگەر عەردێکی بەتاڵ لەگەڕەکەکەی
خۆمان شک ببات پێم بڵێ هەتا بەتەنیا یان بەیەکەوە بیکڕین و
بیکەینە خانووە بەڵام هەموو جارێک دەی ووت هیچ خۆت ماندوو
مەکەو لێرە مەگەڕێ ، لێرە هیچ عەردێکە بۆ فرۆشتن نەماوە ،
ئەگەر هەبوایە لەمێژبوو من دەمکڕی .
مەگەر بڵێ خوا بەحەقە پێی بڕوابکەم دەنا هیچ . ساڵێکە بوو
بەدەورەی پارچە عەردێکی پشت ماڵی باوکم دەخولاوە ، ڕۆژی دەستە-
یەک خەڵکی گەڕەکی دەهێنا سەرو مشاوەرەی دەکردن کە چ جۆرە
نەخشەیەکی بۆ باشە . لەهەموو خەڵکی گەڕەکەو لەمنیش هەروابوو
کە ئەمیشی کڕیوەو دەیەوی بیکاتە خانوو . کەچی بەم دواییە
یەکێکی تر خانووی لەسەر بەرز کردەوە ، کەلێیم پرسی ووتی
ساڵێکە زیاتر بوو ئەم عەردەم هەراج کردبوو ، کەس عانەیەکی
پێ نەدا ناچار بووم وازی لێ بهێنم و بۆخۆم بیکەمە خانوو .
منیش لێم پرسی ، ئەی ئەم عاردە هی سەعید نەبوو ؟!
ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو بەخەمەوە ووتی!
ـ ئەدی هەر ئەو ناڕەسەنە نەبوو کڕیارەکانی فرێودا و پشتی
منیشی شکاند .
بەپێکەنینەوە پێم ووت !
ـ نازانی مەبەستی چی بوو ؟
ووتی!
ـ چۆن نازانم ، چەند جارێک هاتە لام و نرخێکی زۆر کەمی
پێی داو دەیویست بەخوڕایی لەدەستم دەربێنێ منیش بەو نرخە
پێم نەفرۆشت . نەشم زانی لێم مردار دەکاتەوەو خۆی دەکاتە
خاوەنی هەتا کەس لێی نزیک نەکەوێتەوە .

ڕۆژێک دەمی نیوەڕۆ بوو لەدایەرە دەهاتمەوەو سەعید زەبۆکم لەسەر پارچە عەردێک لەنزیک ماڵی باوکمەوە بینی لەگەڵ پیاوێکی عەرەب ڕاوەستابوو قسەی دەکردە هەنگاوەکانم بچوک کردنەوەو گوێم قوڵاخ دا ، لێ یان نزیک کەوتمەوەو بە بیانووی سڵاوکردن سەرنجی قسەو ئیشارەتی دەستی یانم دەدا ، دیار بوو ئیشارەتی بۆ ئەو عەردە دەدا کەلەسەری ڕاوەستابوون و دەشی ووت : ڕووبەرەکەی زۆر گەورەیە بەهەمووکەس ناکڕدرێ ، خەڵک هەژارەو مەتری بیست دیناریش بەدەم خۆشە .

کەدوورکەوتمەوە ڕاوەستام و سەیرم کردن هەتا لەیەکجیابوونەوە ئەوجا قاچێکم کردە دووان و وەکو ماسز خۆم گەیاندە پیاوە عەرەبەکە . ماڵی لەنزیک عەردە بەتاڵەکە بوو ، خۆی پیاکردە ژوورەوە ، منیش دوای ئەو بەچاو تۆچانێک گەیشتە جێ ، هەندێک خۆم خافڵاند ، دوای تۆزێک لەدەرگام دا . پیاوەکە هاتە دەرەوە و ووتی:

– چیت دەوێ ؟

ووتم :

– وەکو زانیبێتم تۆ عەردت هەیە بۆ فرۆشتن . ووتی:

– بەڵێ ئەو عەردەی تۆزێک پێش ئێستا لەگەڵ سەعید لەسەری وەستابووین و تۆش سڵاوت لێ کردین هی منەو دەیفرۆشم .

ووتم :

– من کڕیارم بەچەندی دەدەی ؟

ووتی :

– تائێستا سەعید هەژدە دیناری پێ داوە نەم داوەتی ، تو مەتری بیست دینارم بدەرێ و موبارەکت بێ .

ساڵێک زیاتر بوو بەدووای پارچە عەردێکی ئەوهادا دەگەڕام ، ئەم سەرو ئەوسەری گەڕەکەکەمانم کرد لە سێ دینار کەمتر کەس عەردی پێ نیشان نەدەدام . کەگوێم لەبیست دینار بوو

لەخۆشی یاندا شاگەشکە بووم ، هەزار دینارم لابوو بەبێ سێ و دوو دامەدەستی و ووتم :
- ئەم هەزار دینارە پێشەکی و ئەوەی تریشت دوواییی بۆ دێنم .
پارەکەی وەرگرت و ووتی :
- خێری لێ ببینی .
ئەوەی ڕاستی بێت ، عەردەکە شەشسەد مەتر بوو ، منیش پارەی ئەوەندەم لەتواناندا نەبوو بۆیە بیرم لەوە کردەوە کەخۆم بکەیەنمە لای سەعید زەبۆکەو بیکەمە شەریکی خۆم .
چوومەلای و بە پێکەنینەوە پێم ووت :
- زۆر لەمێژە عەودالّی عەردێکم لەو گەڕەکەی خۆمان بەلاّم دەستم ناکەوێ ، ئەی تۆ ؟
ووتی :
- کووا عەرد لێرە دەست دەکەوێ ؟! ئەی نابینی منیش شەوورۆژ ڕاوەستانم نی یە و دەسوڕێمەوە کەچی هەتا ئێستا بستە عەردێکم نەدۆزیوەتەوە .
ووتم :
- دەڵێی چی ئەگەر من پارچە عەردێکم لەو نزیکانە کڕیبێت و بەشی تۆشی لێ بدەم ؟
چاوی زەقە بۆوەو دەمی بستێک بەش بۆوە ، تووکی سەری وەکو قامیش بۆ ئاسمان بەرز بۆوە ، زیاتر هاتە پێشەوەو ووتی :
- چی ؟! عەردت لەو گەڕەکەی خۆمان کڕیوە ؟
ووتم :
- بەڵێ :
ووتی :
- ڕووبەرەکەی چەندە ؟
ووتم :
شەش سەد مەتری ڕێکە :

هەر ئەمەندەم ووت ، بەهەردوو چەپەڵۆکێ کێشای بەسەری خۆی داو ووتی :

ـ قورم بەسەر ، ناکات عەردەکەی لەمەڕ عەبدول ستار بێتە ؟!

ووتم :

ـ بەڵێ خۆیەتی ، چۆنت زانی ؟

دەمی تێک ئالاَ ، نەیزانی چۆن وەلاَم بداتەوە ووتی !

ـ مەترۆی بەچەند حسێب کرد ؟

ووتم :

ـ بیست دینار .

هەردوو دەستی کێشا بە ئەژنۆی خۆی داو بەدەنگێکی بەرزەوە ووتی:

ـ تێکت دا ! پارەیەکی زۆرت پێی داوە . ئەوە چەند رۆژە من لەبن سەری دەخوێنم کەبە هەژدە دینار لەبن دەستی دەربهێنم بەلاَم تۆ ئەم دوو دینارەت لەخۆڕایی بۆی زیاد کرد !!

ووتم :

ـ قسە هەزارەو دووانی بەکارە . من نامەوێ وەکو تۆ هەر بۆخۆم بژیم . تەیناکات بەشی تۆشی لێ دەدەم. ئێستا ئیوەییت دەوێتەوە یان نا .

تۆزێکە تێک چوو ، دەستەکانی گرتم و بەرەو ژوورەوەی کشاندم.

ووتی :

ـ ئەی چۆن نامەوێ ، زۆر سوپاسیشت دەکەم ، ئەگەر ئەو عەردەم لەدەست بچێ لەسەر ساجی عەلی دەمێنمەوە .

هەر بۆ ئێوارە بەیەکەوە چووینەلای عەبدول ستارو باقی پارەکەمان داپێی .

لەرێی هاتنەوە زۆر ستایشی خۆی کردو ووتی :

ـ خوا دەزانێ بەقەد هەموو مناڵەکانم خۆشم دەوێی ، من بۆ قازانج و بەرژەوەندی تۆ ئەم عەردەم لێ شاردیتەوە ، زانیم خۆت پێ ناگیرێ و نرخەکەی بەرز دەکەیتەوە . ویستم بەهەژدە دینارەکە لەبن دەستی دەربهێنم و بتکەمە شەریکی خۆم لەنیوەی .

# ویستی فێڵم لێ بکات

ماڵمان زۆر لەماڵی زەبۆکەوە دوورنەبوو . لەگەڕەکی بادادوە بووین . ڕۆژی پاشتر کەعەردەکەمان بەیەکەوە کڕی ، بەیانی زوو ، هێشتان ئاسمان هەر تاریک و ڕۆن بوو ، تازە دەمێکە بوو مەلای بەیانی بانگی دابوو ، یەکێک لەدەرگای دا . خەوم زۆر خۆش بوو ، هەندێکە خۆم هێناو برد . ویستم هەستمەوە ، خەو چاوەکانی بەرنەدام و خەوتمەوە . ئەوجارەیان بەتووندی لەدەرگا درایەوەو بەدەنگێکی بەرز بەناوەکەم بانگی کردم و ووتی:

- دەرگاکە بکەوە ، خۆمانین ، ئیشێکی بەپەلەم پێتە . ئەیتانەم بەنەعلەتە کرد ، لەخەو هەستام دەم و چاوم شوشت و دەرگای حەوشەم کردەوە . بینیم سەعید زەبۆکە . کیسەیەکی نایلونی پڕ لەپارەی بەدەستەوەبوو ، دایە دەستم و بەتەنگە نەفەس و هەناسە سواری یەوە ووتی:

- ئەو سەگبابە تارەسەنە درۆی لەگەڵ کردین و لەفرۆشتنی عەردەکەی پەشیمان بۆتەوە ، ئەوەش پارەکەی تۆ ، بەڵام هیچ خەمت نەبێ ئەو عەردە نا عەردێکی تر ! پارەی خۆمان دەدەین و مەلا لەمزگەوتە دەردەکەین .

سەری خۆم لەقاندو پێکەنینم بەقسەکانی دەهات ، وام دەزانی گوێزم بۆ دەبژێری . وادەزانی نێچیرێکی نەزان و نەفامی بەر دەست کەوتووە . نازانی من دەزانم چەند مووی بە سەرەوە هەیە و ئەو قسەیەی ئەو دەیخوا ناوکەکەی لە باخەڵی من دایە ! مەگەر هەر لەمناڵی یەوە شارەزای فڕوفێڵەکانی نەبووبم ، بۆیە یەکسەر زانیم ئەو ماستە گوریسێکی تیدایە . پارەکەم فڕێ داوە دەستی و ووتم :

- من عەردم لەتۆ نەکڕیوە هەتا پارەکەم بدەیتەوە ، من عەردم لەعەبدول ستار کڕیوەو پارەم داوەتە دەستی ئەو هەتا ئەو

نەبینم هیچ نالێم . هەرچەندی خۆی هێناوبرد ، ویستی ڕازیم بکات بەڵام بێ سوود بوو . لەخەمان خەو نەچووە چاوەکانم ، لەگەڵ دەرهاتنی ڕۆژ خۆم کۆڕی و بێ نان خواردن چوومە دەرێو بەخیرایی خۆم گەیاندە ماڵی عەبدول ستاری خاوەن عەردو گلەیی پەشیمان بوونەوەکەییم لێی کرد . پیاوە وەختابوو دڵی ببورێتەوە لەقسەکانم سەری سوڕمابوو . نەی دەزانی شادە بە قسەی کام لامان بێنی ! ووتی !

- شەیتان بە نەعلەت بێت ، تۆ چی دەڵێی و سەعید چی دەڵێ ؟!

ئەمشەو سەعیدو ژنەکەی هاتنە ماڵمان و ووتیان گوایا تۆو ژنەکەت لەسەر کڕینی عەردەکەی من لێتان بۆتە دەمەقاڵێ ، ژنەکەت ووتوویەتی عەردمان لەم نزیکانە ناوێ تۆش ووتووتە ، قسەیەکەو کردوومە لێی پەشیمان نابمەوەو سێ بەسێ تەڵاقیشت فرێ داوە کەپارەکەت لەمن وەرگریتەوە . گوایا سەعیدو ژنەکەشی ووتوویانە ، ئێمە ئاوبژیمان کردوون و لەسەر ئەوە ڕێک کەوتووین کەخۆمان بەشە عەردەکەی ئەویش هەڵبگرینەوە هەتا سوێندەکەی لێ نەکەوێت .

که ئەمەی ووت عەجایەبم پێ هات ، چۆن ئەم جگە سزە شتی وای بۆ ڕێک خستوومە . سوێندم بۆی خوارد کەئەمشەو نە سەعیدو نە ژنەکەشیم نەدیتووە . من و ژنەکەشم هیچ دەمەقاڵێمان نەبووەو پەشیمانیش نەبوومەتەوە . ئێمە لەم قسانەدا بووین و سەعید زەبۆک وەکو لەعەیبی خۆی گەیشتبێ بەپێکەنین هاتەلامان . عەبدول ستاری خاوەن عەردیش چەنگە تفێکی تێ کرت و بەدەنگێکی گەورە ووتی !

- مەلعون شەرم ناکەیت ، ئەم درۆو دەلەسانە بۆ ئەم بەستەزمانە ڕێک دەخەیت . بۆ خۆت بمریت باشتر نی یە لەو حاڵە ؟ دەوەڵامی ئەگەر ئەو ڕازی نەبێت بستێک عەردتە پێ نافرۆشم .

لەبەرئەوەی توانای کڕینی هەموو عەردەکەم نەبوو ، بۆیە بە

ناچاری لەگەڵی مامەوەو ناوی خوامان لێ هێناو دەستمان کرد بە جێ بەجێ کردنی بەناوکردن لەدا یەرەی زەوی و زارە عەردەکە دوو ڕووی لەسەر شەقامی گشتیی بوو ، بۆیە بڕیارمان دا بیکەینە چوار بەشەو دوای تەواوکردنی مەعامەلەی ئیفراز هەر پارچەی لەسەر ناوی یەکێکە دابنێین و چوار دایەرە خانووی خنجیلانەی لەسەر دروست بکەین .

سەعید زەبۆکە بەشە عەردەکەی خۆی لەسەر ناوی دوو کچی خۆی دانا ، منیش پارچەیەکم لەسەر ناوی خۆم داناو پارچەکەی تریشم لەسەر ناوی برام دانا .

هێشتان مەعامەلەکە تەواو نەبوو بوو ، پلانێکم بۆ دەست پێ کردنی خانووەکان دانا بەهیوای وەرگرتنی سلفەی عەقاری . چونکە دوای کرینی ئەو پارچە عەردە هیچ پارەیەکی وام بە دەستەوە نەما کە خانوێکی پێ تەواو ببێت .

# هاتووچۆمان بۆ دایەرەی زەوی و زار

چەند ڕۆژێکم مۆڵەت لە دایرەکەم وەرگرت و لەگەڵ سەعید

زەبۆک کەوتمە دوای مەعامەلەکەمەوە . لە بەڕێوەبەرایەتی

شارەوانی ئیشی مانگێکمان لەبەر خاتری من بەهەفتەیەک ئەنجام

داو عەردەکە کرایە چوار بەشی یەکسان .

زۆر بە پەلەپووم بۆ وەرگرتنی سلفەی عەقاری بۆیە هەر ڕۆژێکم

بەلاوە ساڵێک بوو. بەهەرحاڵ مەعامەلەی لێک جیاکردنەوەکەمان

تەواو کرد ، تەنیا بەناوکردنەکەی لە دایەرەی زەوی وزار مابوو،

ئەویشمان نیوەشێو کرد . لەگەڵ سەعید زەبۆک و دوو کچەکەی و

من و براکەشم لەژووری بەڕێوەبەر ڕاوەستابووین چاوەڕوانی

بەناوکردن بووین . مەعامەلەکە لەسەر تەواو بوون بوو. لەناکاو

هەر ئەوەندەم بینی بەڕیوەبەر هەستایە سەرپێ و هەتا هێزی

لەبەردابوو مستی کێشا بە مێزەکەی بەردەمی و رووی لەسەعید کردو

ووتی :

- سەعید خوا بتگرێ ئەمەشت کرد ؟! دەتەوێ نان براوم بکەیت .

خاوەنی یەک سەر خێزانم دەتەوێ تووشی بەندیخانەم بکەیت ؟

منیش لەجێی خۆم حەپەسام و نەمزانی مەسلە چی یە. دەبوو

سەعید چ ئوینێکی تری نابێتەوەو چ کلاوێکی سەربە کورینگی

لەسەری بەڕیوەبەری زەوی وزار نابێت .

ڕووم لەبەڕێوەبەر کردو ووتم :

- جەناب چی خراپی کردووە ؟

سەری خۆی لەقاندو ووتی :

- کوڕم تۆ هێشتان ئەم سەعیدە باش ناناسیت . نازانیتە چ ماڵێکە.

من کەئەم قورمساغە دەبینم ، لەترسان تام دێتێ بێ بەختیش

ساڵ وەختی ساڵ بووە بەئاشنای ئەم دایەرەی ئێمەو کەس نەماوە

لەمناڵەکانی و خزم و کەسو کاری پارچە عەردێکی لەسەر

- جا ، کێ ووتوویەتی کچەکەی من هەژدە ساڵی تەواو کردووە ؟

جێگری بەڕێوەبەر بەسەر سوڕمانەوە :

- دیارە دانیشی پیادا دەنێی ؟

سەعید زەبۆک بەبێ ئەوەی هیچ خۆی بشێوێنێ ووتی :

- کچی خۆم نی یە ، چۆن نازانم تەمەنی چەندە ؟

جێگری بەڕێوەبەر !

- ئەی کەئەمە تە دەزانی بۆچی دەنگت نەکرد ؟

سەعید زەبۆکە :

- من چووزانم ئەمە نابێ !

جێگری بەڕێوەبەر ڕووی لەبەڕێوەبەر کردو ووتی:

- مەگەر تەزویری کردبێت ، ئەگینا چۆن شتی وا لەسەرم ڕەت دەبێ .

خوا نەبێ کەس دەرەقەتی ئەم عفریتە نایێ !!

بەڕێوەبەری تاپۆ هەمووی بەری چەند مانگێک بوو بەکەفالــە لەتەوقیفە بەربووە لەسەر ئەوەی مەعامەلەیەکی کڕین وفرۆشتنی- یان جێ بەجێ کردبوو ، بەبێ ئەوەی خاوەنەکەی ئاگای لــێ بووبێت . دووای ماوەیەک کەخاوەنەکەی دەچێتە تاپۆ داوای قۆچا- نەکەی دەکات پێی ڕادەگەیەنن کەقۆچانەکەی لەسەر ناو نەماوەو بەناوی یەکێکی تر تۆمار کراوە. پیاوەی خــاوەن موڵکیش داوای لەسەر بەڕێوەبەری تاپۆ بۆ دادگا بەرزکردبۆوە . ئــەوەبــوو بەڕێوەبەری بەستەزمانی یان خستە ژوورەوە بەبێ ئەوەی لــەو موخالەفەیە مەبەستی هەبووبێ هەڵــەی بەڕێوەبەر لەوەدا بــووە لەدەم و چاوی ئەوکەسە وورد نەبۆتەوە کەئیمزای لەجیاتــی خاوەن قۆچانەکە لەبەردەمی کردبوو .

بەکورتی ئەوەی لــەو مەسەلەیەدا هەبووەو نەبووەئەوەبوو پیاویکی ساختەچی وەکو سەعید زەبۆکی لەمەڕ خۆمان خۆی کردبۆوە خاوەن موڵکە ئەسڵی یەکەو لەجیاتی ئەو لەهەموو شوێنێکی مەعامەلــەی کڕین و فرۆشتنەکە ئیمزای کردبوو بەبێ ئەوەی فــەرمانبەران و

بەڕێوەبەری تاپۆ کەسی یان شک بکەن ، چا لەبەر ئەوە بەڕێوەبەری تاپۆ هێشتان بریقی کۆنی سارێژ نەبوو بوو، کە ئەم ساختەیەی سەعیدیشی هاتە سەر هۆشی لەکەللەی دا نەما .

ئۆقرەی لەبەر بڕا ، دەتووت جیوەی تێ کراوە، قوونی لەسەر کورسی یەکەدا تۆتکەی نەدەگرت ، وەکو سپرینگ لەجۆی خۆی هەڵدەزەقی یەوەو لەبەردەمی خۆی هەر پلتەی بوو، نەشی دەزانی چی بکات .

ئەم سەعید زەبۆکە ، ساختەچی یەکی ئەوەندە زانایە ، کڵاو لەسەری هەزار کەس دەنێت بەبێ ئەوەی لەزمەیەکیش بداتە بەدەستەوە .

بەڕێوەبەری تاپۆ هەر چاوێکی کردبووە دەچاوو وورد و درشتە چەند جارێک بەفایلەکەدا هاتەوە، ئارەقەی سوورو شینی بەدەردا بوو . چاوەکانی لە تووڕەیی یان سوور هەڵگەرا بوون .

نێو چەوانی ئاگری لێ دەباری ، ڕووی لەسەعید زەبۆک کردو ووتی:

- سەنعاتەکە ڕەزیل بووەو وەزیفە لەنێوچەوانی دوو ساختەچی وەکو تۆ خێری پێوە نەماوە .

ڕووی لەجێگرەکەی کردو ووتی :

- ئەوکاتەی کەلەسەر ساختەی پیاوەکەی پێشوو هاتمە گرتن ئەگەر خۆم خانەنشین بکردبا ئێستاش دووچاری ئەم ساختەچی یە نەدەهاتم !!

ڕووی لەئێمە کردو بەتووڕەیی یەوە ووتی :

- بڕۆن هەتا شەش مانگی تر نەیەنەوە بێرە ؟

منیش بەسەرسوڕمانەوە ووتم :

- جەناب سووچی من چی یە ، ئەو ماوە دوورو درێژە بۆ چاوەڕێ بکەم؟!

ووتی :

- بۆ لەمن دەپرسی ؟ لەسەعید بپرسە، ئێوە ئەم پارچە عەردەتان بە شەراکەتە کڕیوەو دەتانەوێ بەشی بکەن و لەیەکی جیا بکەنەوە ،

بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ خاوەن هەموو بەشەکان تەمەنی یان لە هەژدە ساڵ کەمتر نەبێت و تاکو توانای تەسروفی یاسایی یان هەبێت . جا چاوەرێ بکە هەتا کچەکەی جەنابی سەعید هەژدەساڵ تەواو دەکات .

هەر لەوڕۆژەوە هەتا پەروینی کچی سەعید زەبۆکە هەژدەساڵی تەواوکرد و دەتووتە چاوەڕێی دەرچوونی بیتاقەی یانەسیبە دەکەم . هەموو ڕۆژی خەتێکم بە ڕۆژ ژمێرەکەم دا دەهێنا .

لەو ماوەیشدا کەرەستەی خانووبەرە ڕۆژ بەڕۆژ نرخی بەرز دەبۆوە . سەرباری تەنگە پێ هەلچنینم لەلایەن ئەو پیاوەی خانووەکەی پێشووی لێ کرێ بووم . هەموو ڕۆژێ دەیووتە ئەوە چی بوو خانووەکەت هەر تەواو نەبوو . ئەوەبوو لەپەلەی خانوو چۆڵ کردن و لەترسی بەرزبوونەوەی نرخی کەرەستەی خانوو و بە ناچاری پارچە عەردێکی یانم بەپارەیەکی کەم فرۆشتەوەو بە پارەکەی خانوێکی بچوکم بەبێ ئیجازەی بینا لەسەر پارچەکەی تر بەرز کردەوە .

# چۆن خانوومان بەیەکەوە دروست کرد

بەیەکە ڕۆژ هەردووکمان نەخشەی خانوومان لەسەر عەردەکان داڕشت . هەریەکی چوار کرێکارمان گرتبوو بۆ هەڵکەندنی بناغەی خانوو . ئێوارە داهات و کرێکارەکان دەستی یان لەکار بەردا .
هەرچەندە کرێی کرێکار ئەوکاتە چواردینارو نیو بوو بەلاّم لەبەر ئەوەی کرێکارەکانی من زۆر خۆیان ماندوو کردبوو بۆیە یەکی پێنج دینارم دانێ . کرێکارەکان خواحافیزی یان لێ کردم و دوور کەوتنەوە سەعید زەبۆکە هاتەلام و پرسی :

– چەندت بۆ حسێب کردن ؟

ووتم :

– پێنج دینار .

هەر ئەوەندەم ووت ، نەمزانی چۆن وەکو کەروێشکە بۆی دەرپەڕی و کەوتە دوای کرێکارەکان و هەر چواری گەراندەوە لام و ووتی :

– نەخوا قەبوولّی دەکات و نە پێغەمبەریش ئێوە ئەم نیودینارە زیادەیە لەم پیاوە وەربگرن . خۆتان دەزانن حەرامە وەکو چلّکی سەگ وایە . ئەگەر نەیدەنەوە بەشاگری جەهەنەم دەسووتێن .
کرێکارەکان ڕوویان لەسەعیدکردو ووتی یان :

– حاجی بۆ حەرامە ، خۆ بەزۆری لێمان نەسەندووە ، ئەو خۆی ئەو نیودینارەی زیاد داینێ .
سەعید ووتی :

– چۆن حەرام نی یە !؟ هەرکەسێکە لەحەقی خۆی زیاتر وەربگرێت حەرامە . ئەوە قسەی من نی یە ، شەرع وا دەڵێ . ئێوە موسلّمان نین !؟

هەر چواریان بەیەک دەنگە ووتی یان :

– چۆن موسلّمان نینە !؟

سەعید ووتی :

– ئەگەر موسلّمانن فەرموون بیدەنەوە ؟

سەرم لەم کردەوەی سەعید زەبۆکە سوڕما بوو ، هەرچەندی بیرم لێی دەکردەوە سەرم لێی دەرنەدەچوو .
لەبیری خۆم دەمووت ، لەوە ناچێ بۆ خاتری من لێ یان وەربگرێتەوە .
پێم ووت :
- سەعید لێ یان بگەڕێ من خۆم ئەم نیودینارە زیادەیەم داونەتێ؟
لێم هاتە پێشەوەو ووتی :
- چۆن قسەی وادەکەی ، دەتەوێ ڕزقیان حەرام بکەیت ؟
یەکێک لەکرێکارەکان ڕووی لەوانی تر کردو ووتی :
- من ئەو نیودینارە نادەمەوە ، با حەرام بێت . ئێوەش ئارەزووی خۆتانە . ئەوانی تر دەستی یان بو باخەڵی یان بردەوەو یەکی نیودیناری یان بۆ ڕەت کردمەوە . هەندێک دوورکەوتنــــەوە ، کرێکارەکەی تریشیان ڕازی کــرد ، ئەویش نیودینارەکەی بـۆ ڕەت کردمـەوە . زۆر بە کردەوەی سەعید تەڵس ببووم ، بەڵام دەستی ڕدێنە سپی یەکەییم شکابوو ، ئەگینا بەخۆییم دادەشکانـدەوە .
پێم ووت :
- پێم نالێی تـۆ حەقی ئەمەت چی بوو ؟!
ووتی :
- ئەگەر من حەقم نەبێ ، ئەی کێ حەقی هەیە ؟
ووتم :
- لەبەر چی ؟
ووتی :
- نازانی ئەمڕۆ نیودیناری زیادە بدەیتە ئەم کرێکارانە بەیانی لەلایان دەبێتە عادەتەو بە ڕۆژانەکەی پێشان کار بۆمن ناکەن . دیارە دەتەوێ ڕەوشتی یان تێکە بدەیتەو زیان لەبەرژەوەنـــدی من بدەیت ؟

ڕۆژێکی تر نیازی هینانی وەستاو کرێکارم هەبوو بۆ دیوارکردن، بۆیە تانکەرێکە ئاوم کڕی و حەوزەکەم لێی پرکرد . بەیانی یەکـــەی

وەستابیەکەم بەکاری ترەوە خەریک بوو بۆیە ئەو ڕۆژەیان نەهات .
بۆ ڕۆژی دواتر هات . کرێکارێکی لەدووا ناردم و گلەیی یەکی
زۆریشی پێدا ناردبووم . گوایا ئاوم بویان دانەناوە .
سەرم لەگلەیی یەکەی سوڕما ، ئەمسووی بەری دوو ڕۆژ بوو تانکەرێک
ئاوم کڕی بوو . بۆیە بەدڵنیایی یەوە چوومە سەرکارو ئەمەم پێ
ووت :
دەستی گرتم و بولای حەوزی ئاوەکەی بردم ووتی:
- سەیرکە ، هیچ ئاوی تیایە یان نا ؟
کەسەیرم کرد ، حەوزەکە چۆڕدرابوو ، بو دەرمانیش دڵۆپێک
ئاوی لەناو نەمابۆوە . بەدراوسێ کەمانم ووت :
- نازانن کێ ئەم ئاوەی بردووە ؟
ووتی :
- چما پرسی تۆی نەکردووە ؟
ووتم :
- کێ ؟
ووتی : لەسەعید زەبۆکە زیاتر کێ هەیە ؟!
سەری خۆم لەقاندو زیاتر لەسەری نەڕۆیشتم . ئەو ڕۆژەیان
لەبەر بێ ئاوی زیانی ڕۆژە ئیشێکم لێ کەوت . چاوم چوبووە
پشتی سەرم ، ئاگرم لەنیوچەوان دەباری ، هەر لەبەیانی یەوە
هەتا درەنگە لە کۆڵانێ دەهاتم و دەچووم ، چاوەڕێی ئەم
قورمساغەم دەکرد . پێش نیوەڕۆ بەدیارکەوت . وەکو بلێی بە
عەیبی خۆی شکە بردبێتە بۆیە هەر لەدوورەوە بەپێکەنین
بەرەولام هات و پێشی لێ گرتمەوەو ووتی:
- دوێنێ کرێکارم هەبوو ، ئاویشم نەگرتبوو ، ئاوەکەی تۆم لەکار
کردو بەکرێکارەکانم ووت ماڵمان لەگەڵ یەکە جیا نەکردۆتەوە ،
برای دینین . ناموسی لی دەربچێتە بۆ هیچ خاوەن ماڵ نیمە .
بەدەستە ئیشارەتی بۆ خانووەکەی خۆی کردو ووتی :

ـ ئەم خانووەش هەر خانووی خۆتە ، گەردەنت ئازاد نەبێت ئەگەر شتێکت پێ ویست شەرم بکەیت بیبەیت . لەڕاستی تۆ مـــن خاوەن ماڵ نیمە . ئێمە برایـنە برای دینین !!

دڵێکی زۆر حیزانەم هەیە ، بەدوو قسەی خۆش سارد دەبێتەوە . ئەم قورمساغەش ئەوەندە زمانی لووسە نەبێتەوە . بەم قسـە قەڵەوانە ، چۆن شاو بەشاگـر دابکەیت ئەوها ساردی کردمەوە . لەجیاتی هەڕەشەی لێ بکەم و بۆ هەموو خەڵکی گەڕەکی تەمـبێ خواردی بکەم ئەوەبوو ئەمجارەیان ڕێشم پێ دا کەهەر شتێکـی بیەوێ بیبات .

بۆ ڕۆژی دواتر ، دەرسم لەشاو دزینەکەی پێشتر وەرگرتبـوو بۆیە تانکەرێکە ئاوم کڕی و بەیانی زوو لەگەڵ خۆم هینامە سەر ئیشەکەم . کەچووم بینیم وەستاو کرێکارەکانم چاوەڕێم دەکەن . خاکەناسو عەرەبانەو کەرەستەی کارکردنی یان ئامادەکردبوو ، بەس ئەوەندەی مابوو دەست بەکاربکەن . تانکەرە ئاوەکەمان بەتاڵ کردە ناو حەوزەکە . وەستاش دوو کرێکاری ناردە ژوورەوە هەتا چەمەنتۆ بهێنن و خەفتە بگرنەوە . لەکۆڵانێ لەپێش خانووەکەم لەگەڵ شوفیری تانکەرەکە ڕاوەستابووم قسـەمان دەکـرد ، گوێم لێ بوو ، کرێکارێکە بەوەستای دەووت هیچ چەمەنتۆی لێ نیە . کەئەوەم گوێ لێ بوو ، ئیمانم لەکەللەدا نەما ، وەختبوو لـە داخان شەق ببەم . ساڵێکی نەهاتە بەدەستە ئەم سەعید زەبۆکەوە ، ڕۆژێکە ئاوەکەم دەدزێ و ڕۆژێکی تر چەمەنتۆ . خوانەبێ کەس نازانێ بەیانیش چی ترم لێ دەدزێ .

چوومەلای وەستاو پێم ووت :

ـ ئەگەر بەیەکەوە چەمەنتۆکەمان لێرە دانەکرتبا لەوانەبوو پێت باوەڕ نەکردبام ؟!

هەرچەندی گەڕاین و سوڕاین هیچ چەمەنتۆمان نەدیت . چوومە سەر خانووەکەی سەعید زەبۆکە . لەدڵی خۆم ووتم (هەبێ و نەبێ

ئەو قورمساغە ئازدە قەزناغی یە ئەم کەتنەشی کردووەو چەمەنتۆ کەشی وەکو ئاوەکە لووشی یە). هەموو کون و کەلەبەرێکی خانووە ـ کەییم پشکنی یەوە ، تۆزی چەمەنتۆشم بۆ دەرمان نەدۆزی یەوە.؟ دیسان پارەی ئەورۆژەم بۆ کرێکارەکان وێرکردو بەوەستاکەمم ووت :
ـ ئەوجارەیان هەتا پێت نەڵێم نەیەوە ؟
ئەو رۆژەشی یان هەروەکو رۆژی پێشتر لێوەکانی خۆم دەکرۆشتنەوە زۆر نارەحەت ببووم ، چاوەکانم خوێنی یان تێ زابوو ، سەرەدیقەم لەگەڵ کولانەکە دەکردو لەبیری خۆم دەمووت (ئەم جارە ئەگەر بینیم دای دەگرمە بەر مستەو پێلەقە ، چەند پەراسووی هەیە هەمووی بۆ دەشکێنم . وای لێ دەکەم ناوی خۆی لەبیر بچێتەوە ، بەکوی خۆی بلێ پەپە . لە کۆڵ ئەم شارەی دەکەمەوە) زۆر هاتم و چووم بێ سوود بوو . فێری چایە خواردنەوەشم ، ژەمێکە چایە نەخۆمەوە مێشکم دەتەقێ . گێژوو وێژ بووم ، چی تر خۆم پێ رانەگیراو یاغر یاغر بەرەو ماڵەوە گەرامەوە. رۆژی پاشتر دیسان چوومەوە سەر خانووەکەم و بوومەوە ئێشککر. زۆر چاوم گێڕا سێبەری سەعید زەبۆکە لەهیچ شوێنێکە دیار نەبوو. دەمی نیوەرۆ پیکەپێک چەمەنتۆی یان هێناو لەسەر خانووەکەی سەعیدیان داگرت . بەخۆی لەگەڵی یان نەبوو بەمە گیانم گەشاوە. لەبیری خۆم ووتم . (ئۆخەی خوا ناردی لەوە باشتر نابێتە هەتا ئەوەشی لەکار نەکردووە باشتروایە ئیشی خۆمی پێ ئەنجام بدەم).
هەر ئەو رۆژە کرێکارێکم لێی گرت و هەموویم گواستەوە سەر خانووەکەی خۆم . بۆ ئیوارەش چوومە چایخانەی وەستا عەلی و وەستاوکرێکارم تێ گەیاند. شوکور بۆ خوا. بۆ بەیانی وەستاوکرێکار دەستی یان بەکارکردو بۆ رۆژی دواتریش هاتنەوە ، ئەو چەمەنتۆ ـ یەی مابۆوە لەکاری یان کردو خانووەکەم تاسەر دەرگاو پەنجەرە بەرز بۆوە .
رۆژی سێ یەم خەریکی ئاودانی دیوارەکان بووم ، پێکەنینم بەسەعید

زەبۆکە دەهات ، لەبیری خۆم دەمووت (ئەگەر ئێستا بلێتەسەر خانووەکەی و ببینێ هیچ چەمەنتۆی بۆ نەماوەتەوە لەوانەیە لەداخان شەق ببات . ئەگەر دەنگیش بکات دەڵێم بحرای دینین ، ماڵمان لەیەک جیا نەکردۆتەوە !!).

ئەو ڕۆژەیان ڕۆژی من بوو ، لەخۆشی یان قاچەکانم تە دەگەیشتنە سەر عەرد . سەعید زەبۆکیش وەکو حەس حەس لەسەر خانووەکەی دەهات و دەچوو و نەیدەزانی بەچ ڕوویێکە پێم بڵێ .

ئاوە ئاوەش ئاوڕێکی لەی منی دەدایەوەو هیچ دەنگی نەدەکرد . لەداخان هەر هەناسەی ساردی دەکێشاو جگارەی بەجگارە دادەگیرساندەوە ، دەم و چاوی لەگەڵ دووکەڵی جگارەکەی ببوە یەکپارچە ، منیش دانم بەخۆم داگرت و خۆم لەگێلی دا . هەتا ڕۆژیش

ئاوا بوو نەئەو دەنگی کرد ، نە منیش دەنگم کرد . هەردووکمان بەرەو ماڵ گەڕاینەوە .

# مەسەلەی بادلۆ پڕکردنەوەی سەعید زەبۆك

بەیانی یەکە زوو ، لەسەر خانووەکەم پیاسەم دەکرد ، سەعید زەبۆکە هاتەلام و ووتی :

ـ چەند دینارت لەپڕکردنەوەی بادلۆی خانووەکەت چوو ؟

ووتم :

ـ بیست قەلاب خۆڵی ویست ، قەلابی لەسەر دەدینار کردی بە دووسەد دیناری ڕێک . بێ لەدەسحەقی کرێکار بۆ بڵاوکردنەوەی بەناو ژوورەکاندا .

فیکەیەکی درێژی لێدا ، ووتی :

ـ پەکو لەو گرانی یە ، حەقی هەر بیست دینارە .

پێکەنیم بەقسەکەی هات ، بەدەست خۆم نەبوو لەدەمم دەرچوو و ووتم :

ـ دەکە سەرت لەقوڕ بنێن لەگەڵ خۆت و درۆت !

مردیت مرێ ، قسەیەک بکە پێت بڕوابکەن . دوو قەلاب خۆڵ دەکاتە بیست دینار . ماقولە خانووەکەی تۆ بەدوو قەلاب پڕ بێتەوە ؟

لەقاقای پێکەنینی دا ووتی :

ـ دەبینی یەوبە بیست دینار پڕی دەکەمەوە یان نا ؟

ڕۆژی دواتر دەهاتمە سەر خانووەکەم ، لە کۆڵانەکەی سەرەوەی خۆمان بینیم سەعید زەبۆکە سواری سەر شۆفەڵێکە بووە و بەناو کۆرەپان و پارچە عەردە بەتاڵەکان لەگەڵ شوفێری شۆفەڵە کە دەخولێتەوەو بەدەمی شۆفەڵ زبڵی سەر کوفەکەکان و خۆڵی زیادەی تەنیشت ماڵەکان و کۆرەپانەکان هەڵدەگرێتەو دەیکاتە ناو بادلۆکەی . منیش لەدوورەوە سەیرم دەکردو چاوەڕێی ئەوەم دەکرد بزانم دەکاتە کوێ .

دەمە شۆفەڵێکی لەتەنیشت خانووی ماڵێکەدا ، لەگەڵ هەڵکۆڵینی

عەردەکە حەوشەی ماڵەکەی هێنایە هەژان . خاوەن ماڵەکە لێی هاتە دەرەوە و هەزار جوێنی بەفلیچێک پێ دا ، کردی یە ماستەو لەبەر سەگی ڕووکردە ئەویش زۆر ئاسایی بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێکە بدات ووتی:

- لەجیاتی چاکەو پیاوەتی جوێنیشم پێ دەدەی !؟

پیاوەکەش زیاتر لەجاران جوێنی پیس تری پێ دەدایەوەو دەی ووت :

- گو بەپیاوەتیت ، خەریکە خانووەکەم بەسەردا بەردەیتەوە و پێم نالێی چاکەی چیت لەگەڵ کردوومە !؟

ووتی :

- لەجیاتی شارەوانی وا پیسایی تەنیشت ماڵتان فڕێ دەدەم و، لەجیاتی سوپاسم بکەیت هێشتان خۆشتم لێ تووڕە دەکەی .

سەری خۆی لەقاندو ووتی: ناحەقت ناکرم هەرچی پێم بڵێی ، نانم بێ خوێ یە ئەوەی چاکەی لەگەڵ بکەم وەکو مار پەلامارم دەداتەوە . ابراهیمی خانەقینی بۆ پیاوی وەک ئێوە باشە . حەیفە نی یە مانگی جارێک سەد تاکە دینار سزاتان بەتەنگەدانەدا !؟

چەند کۆنە تەنەکەو قوتی بەتاڵ و کۆنە هیرباڕو سەگ و پشیلەی تۆپی و پەڕەمووچی مریشکەو پەلکە شفتی و گندۆرەو تریپە تەماتەی سەر گوفەکان هەبوو لەگەڵ خۆڵەکە کردبوونی یە ناو بادلۆکەی . کەبەتەواوەتی بادلۆکەی پڕکردەوە پانزەدیناری خستە ناو دەستی شوفێری شوفەڵەکەو بەڕێی کرد .

چوومە لای و بەپێکەنینەوە پێم ووت :

- هەر ئەمەش بوو پڕکردنەوەی بادلۆکەت !؟

ووتی :

- بۆ چ عەیبی هەیە ؟ چونکە هەرزانە بۆیە وا دەڵێی ؟!

پێکەنینم هات و سەری خۆم لەقاندو ووتم :

- هیچ عەیبی نی یە ! ئەگەر هەموو کەس وەکو تۆ بادلۆی

خانووەکەی پڕبکاتەوە ، کەس پێویستی بەشارەوانی نابێت بۆ فڕێدانی زبڵ .

سەعید ووتی :

ـ لەوە دەچێ پێمان ڕابوێرێ ؟

ووتم :

ـ بۆ پێت ڕادەبوێرم ، ئەوە ڕاستی یەکەیە .

ووتی :

ـ خۆ من وەکو تۆ خوا لێی نەگۆڕیوم بەمستێکە پارە بادلۆکەم پڕ بکەمەوە .

ووتم :

ـ خۆڵەکەی من خاوێنە بەلاّم هی تۆ پڕی زبڵ و جڕو جانەوەرە . قوڕ بەسەری ئەوکەسەی خانووەکەی تۆ دەکڕێ ، ماڵەکەی دەبێتە بنکەی هەموو نەخۆشی یەک !!

ووتی :

ـ خۆ هەر ئەوها لێی ناگەڕێم ، پێش ئەوەی کاشی بکەم ، دوو تەنەکە نەوتی ڕەشی بەسەردا دەپڕژێنم ، هەموو میکرۆبەکان قەلاّچۆ دەبن .

# دەرگاو پەنجەرەو کاشی  بەخۆڕایی بۆ دێت



خانووەکەی من و دوو خانووەکەی سەعید زەبۆکە نزیکی تەواو بوون بوو . دەرگاو پەنجەرەکانی خانووەکانی سەعید زەبۆکە لەهی مزگەوتی دەکرد ، هەمووی نەقش‌و نیگاری ئیسلامی و نووسینی ئایەت‌و وێنەی منارەو گومبەتی یان لەسەر دروستە کرابوو. کاشی یەکانیشی مۆزاییکی سەوزی توخ بوو .

کەچاوم پێ کەوتە پێکەنینم هاتە و لەبیری خۆم ووتم (سەعیدی فەرمەسۆن و ئەم جۆرە دەرگاو پەنجەرەو کاشی یە سەوزانەیان نەووتووە). دەتووتە مزگەوتە دروست دەکاتە ، کاشی یەکانیشی لەسەوزی یان لەمەندیلی سەیدانی دەکرد . بەسەعیدم ووتە :

- هیچ ڕەنگە نەمابوو هەتا کاشی وەها بەڕادان نەدەیت ؟ ئەو دەرگاو پەنجەرانەش هی مالّن یان مزگەوتە ؟!

ووتی :

- قەحپەبابی وا بەخۆشی دەڵێ وەستا ، نەخش نەماوە هەتا ئەمانەم بۆ دروستە نەکاتە . خۆ کاشی یەکانیش لە دەرگاو پەنجەرەکان باشتر نی یە، ئەگەر لەخانووەکەمی نەدەدەم هەروا دەمێنمەوە ئەگەر لێیشی دەدەم سەد کەسی وەکو تۆ پێم دەڵێ خۆ سەید نیتە ئەم ڕەنگەتە هەڵبژاردووە !

ووتم : چ کارگەیەکە ئەم کاشی و دەرگاو پەنجەرانەی بۆ دروستە کردوویتە ؟ .

ناوی کارگەکەی ووتە . ئەو کارگانەی ئەو ناوی بردن ، شوورەتیان گەیی بووە ئەو سەری وولاتە . لەوە نەدەچوو سەربەخۆ شتی وا بکەن .

ڕۆژێک ڕێم کەوتە ناوچەی کارگە پیشەسازی یەکان ، هەر بەهەوەس کارگەی ئاسنەکەم بەسەر کردەوە ، خاوەنەکەیم دەناسی .

بۆ مەسەلەی نەخش‌و نیگارەکانی دەرگاو پەنجەرەکانی سەعید زەبۆکم

پێ ووت . کابرای خاوەن کارگە سەری سوڕما . ووتی :

- لەجیاتی چاکەو پیاوەتیمان گلەییشمان لێ دەکات ؟! بۆ پارەی پێ داوە هەتا گلەیی بکات ؟ .

منیش ووتم :

- ئەگەر ئێستاش نەیدابێت ، قەرزە لەسەری و هەر دەبێ بیداتە .

پێکەنی و ووتی :

- نەقەرزەو نەدەشی دات !!

ووتم چۆن ؟

ووتی :

- بەخێر لەڕاھی خوا بۆ تەکیەکەی ئەوم دروست کردووە .

کەئەمەی ووت پێکەنینم هات ووتم :

- بەخوا کلاوی لەسەری تۆش نا ، ناکات کاشی یەکانیشی هەر بە خۆڕایی بەناوی تەکیە بۆ کرابێتە ؟!

ووتی :

- ئەوەتۆ چی دەڵێی ، ناکات تەکیەشی نەکردبێ ؟!

دەستم بەپشتی داهێناو ووتم :

- هەی لەمن نەزانتر ، لەجیاتی تەکیە دوو دایەرە خانووی گەورەی لەسەر عەردەکەی بەرز کردۆتەوە .

خاوەن کارگەی توڕبەسەر ، بەهەر دوو چەپەلۆک کێشای بەسەری خۆیداو ووتی :

- بەدوو مانگ ئەوەندەم پێ نابڕێ ، ئەو سەگبابە چۆن فریوی دام .

دڵم دایەوەو پێم ووت :

- هیچ خەم مەخۆ ، هەر تۆی نەتڕاندووە . دەستێکی بەماڵی منیش داهێناوە بەناوی برای دینی ، ئەوا تۆش هاتیتە ڕیزەوە ، خاوەن کاشی یەکەش هەروا . خوا بزانێت هەتا ئەم دوو دایەرە خانووە تەواو دەکات تۆڵی چەند کەسی ترت بۆ دەبڕێتەوە .

بەڵێ ، سەعید زەبلۆک بۆ تەواوکردنی خانووەکانی هەر بە

دزینی ئاوو چەمەنتۆو چــەرو قــوم و كەرپووچی من و دەرگاو پەنجەرەو
كاشی خاوەن كارگەكان نەوەستا . بەڵكو دەستێكی بە قوونی هەمـــوو
ئەو وەستاو كرێكارانەدا هێنا كەرۆژێكە لەرۆژان ئیشی یــان لــە
خانووەكەی دەكرد . ئەگـەر رۆژانەی تەواوی لێ نەبڕیبان ئەوا بەبێ
شك لایەكی لێ قووتە دەكرد ، بەناوی ئەوەی گوایا بەرێكە دەخەنـە
تەكیەكەوە و لە رۆژی حەشر دێتەوە پێ یان .
هەروەها ئیشی لە لەبخچیووەستای سپی كاریش دابوو. دوای تەواو-
كردنی هەمـوو ئیشەكانی لەبخ و گەچ كاری خانووەكانی لەكاتـــی
حسێب كردنی رووبەری ئیشەكان بەمەتر ، ناو دەرگاو پەنجەرەكانـی
پێ فری دان و قەرەپوولێكی بۆ حسێب نەكردن بەبیانووی ئەوەی گوایا
باسی فڕی دان و نەفڕێ دانی ناو دەرگاو پەنجەرەكانی یان لەكاتی
مەعامەلەكردندا نەكردووە . ئەویش بەدرۆی خڵكی گوایا لەهەمـوو
خانوێك ئەو شوێنانەی لەكاتی حسێب كردنی پارەی دەستەقەفرێ داوە.
بەهەر حاڵ خانووەكەم تەواو كردو ماڵم گواستەوە ناوی . سـەعید
زەبۆكیش هەردوو خانووەكەی تەواو كردو دوای ماوەیەك هەردووكی-
یانی بەپارەیەكی چاك فرۆشت و عەردێكی هەزار مەتری لەبەرامبەر
ئەوێ كڕی یەوەو قشلەیەكی گەورەی دوو نهۆمی لەسەر دروست كـردو
ماڵـی گواستەوە ناوی .
هەر لەو رۆژەوە بووینە دراوســێی یەكو ووردو درشت ئاكاداری
هەموو هەڵسو كەوتێكی بووم . زۆرم حەز دەكرد ئاكاداری فـێڵ و
تەڵەكەبازی یەكانی بم بۆیە ئەگەر جاروبار خۆشم بەدەستی یـەوە
زیانم لێ بەكەوتیا هەر باكم نەبوو .

# دەبێ پیشەی سەعید زەبۆك چی بێ

لەوەتی من ئەم سەعید زەبۆکەم ناسیوە هەر دوکانی کەلاش دروستکردنی هەبووە پێشتر لەگەڵ عەبدول ڕەحمانی پینەدۆز بە شەراکەت دوکانێکی پینەدۆزی یان هەبوو و دوایی بەینی یان تێکچوو و لەیەکە جیا بوونەوە، ئیتر هەر لەو ڕۆژەوە هەتا ئەم دوایی یەش دوکانێکی بچکۆکولانەی بەرامبەر بانەی فەرمانبەران هەبوو، تیایدا کەلاشی دروست دەکردو بە دەستەو دانە دەیفرۆشت، زۆر جاران بەرەبەری نیوەڕۆ کەبەتەنیشت ماڵی یان ڕەت دەبووم، گوێم لەتەپەتەپێکی بەردەوام بوو بەڵام ئەم دەزانی چی یە.

هەندێک جاریش لە درەنگی شەودا هەمان تەپەتەپ لە ماڵی یان دەستی پێ دەکردەوە، بەیانی یانیش زوو سەعیدم دەبینی لەلای شار دەهاتەوەو گونی یەیەکی بەکۆڵەوە بوو، زۆرم مەراقە بوو بزانم ئەم عفریتە بەم بەیانی یە زووە لەکوێ دێتەوەو گونی یەکەی سەرکۆڵیشی چی تیایە، ئەمەو تەپەتەپی بەرەبەری نیوەڕۆ و نیوەی شەویش زیاتر لەمەراقی یان هێشتبوومەوە، بەڵام وورده ووردە ئەمەم لەبیری خۆم بردەوەو شەیتانم بە نەعلەت کردو ووتم: (حەقی چیم بەسەری یەوە هەیە، بۆ تێکەڵی ئیشوکاری نهێنی یەکانی ژیانی خەڵکە بم).

ڕۆژێک کاتێ هاوڕێ یەکی دەوری خوێندنم کەپارێزەر بوو چووینە دایەرەی کارکردن بۆلای مامی کەبەڕێوەبەری ئەو دایەرەیە بوو، لەژووری مامەکەی دانیشتبووین و باسی یادگاریی ڕۆژانی خوێندنمان دەکرد، لەناکاو دەرگا کرایەوە، بەدوو پیاو زەلامێکی چوارشانەی تەنکەستووری قەڵەوی یان پاڵدا ژوورەوە. زەلامەکەش بەنکەنکە و نقەنقێ و ناڵەوە خۆی کەیاندە سەر لاقەنەـ فەیەکی بەتاڵ لەبەردەم بەڕێوەبەری کارکردن و لەسەر گازی پشتە بۆی ڕاکشا.

دەتووت ئێستا تا حەوت ساڵە مردووە ، تفەی لەخۆی بـــــڕی .
بەڕێوەبەر کەئەمەی دیت سەروسیمای تێکچوو ، ڕووی لـــــە دوو
زەلامەکەی تر کردو ووتی :
ـ ئەوە چی بەتی ؟
بەخەمباری یەوە ووتیان :
ـ کەچووینە بەردەرکای دایەرە بۆ خاوێن کردنەوەی دیتمــــان
پیاوێکە دەمامکەی خۆی بە جەمەدانی داوەو قاپووتێکی ئەستووری
پۆلیسانیشی لەبەرکردووەو وەکو لاشەی مردوو بەبێ جووڵە لەسەر
شۆستەی شەقامەکە لەسەر لاتەنیشتێکە لـێی کەوتووە . سەرەتـا
وامانزانــی مردووە یان کوژراوە بەڵام کەلێی نزیکە کەوتینەوەو
بینیمان ئەوە سەعیدی خۆمانەو شوکور ماوەو نەمردووە . بـــە
هەردووکمان دەستمان خستە ژێر شانی و بۆلای جەنابتمان هێنا .
بەڕێوەبەر هێندەی تر تەنگاو بوو ، لێی نزیکە کەوتەوەو زۆر بانگی
کــرد :
ـ سەعید ... سەعید ... مای ؟ ئەوە چیتە ؟
سەعیدیش وا خۆی بێ هۆش نەکردبوو کەس بزانێ ، دەتووتە لـــــە
حەوت باری خەودایە ، نەفەسی لەخۆی بڕی بوو .
بەڕێوەبەر زۆر هەوڵی لەگەڵ داو هەندێک زلەی لە لا ڕوومەتەکانـی
داو پەرداخێک ئاوی بەدەم و چاوی داکرد. ئەوسا هـەندێکە خۆی
جوڵاندەوەو دەستی کردەوە بەنقەنقە .
کەناوی سەعیدم گـوێ لێ بوو ، سەرنجی دەم و چاویم دا بیناسمەوە
هەرچەندە نەشی دەچووە ئەقڵەوە سەعید زەبۆکی لەمەڕ خۆمان بێتە .
بەڵام بۆنـا ؟ لەبەژن و سەرو قەڵافەتی هەر لەوی دەکرد ، سـەعـید
زەبۆکیشەوە هەموو شتێکی لێ دەوەشێتەوە . لــێی وورد بــوومـــەوە
بینیم ، جەمەدانی یەکــی ڕەشی لەدەم و چاوی خۆی پێچابــۆوە و
قاپوتێکـی ئەستووری خاکیی سەردەمی عوسمانلی بەم چلـەی هاوینـــە
لەبەرکردبوو . چەندی دیقەتی دەم و چاویم دا لەبەر جەمەدانی یەکەی
نەم ناســی یەوە .

بەڕێوەبەریش هەر خێرا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و بەتەلەفۆن داوای
لە نەخۆشخانەی کۆماری کرد تا ئۆتۆمۆبێلێکی فریاکەوتنی بۆ
بنێرن و لە نەخۆشخانەی بخەوێنن . لەم سەین و بەینەدا من هەر
خەریکی سەرەدیقەو وورد بوونەوەی شێوەی دەم وچاوی ئەم زەلامە
بووم . دوای تۆزێکە ئۆتۆمۆبیلەکە گەییەجێ و دوو برین پێچ بە
خۆو بە نەقالەوە هاتنە ژوورەوەو خستی یانە سەر نەقالەکە .
وویستی یان بیبەنە دەرەوە ، ئەمجارەیان بە تەواوی دەم وچاویم
بینی ، سەعید زەبۆکە خۆی بوو ! چاوم ئەبلەق بوو ، لەجۆی
خۆم حەپەسام ، وەکو بڵێی ئەویش هەستی بەوە کردبێتە کە
ناسیبێتمەوە بۆیە لەژێرەوەی چەمەدانی یەکە ، چاوێکی لێ قوچاندم
و سەری خۆی تۆزێکە بەرز کردەوەو بەناڵەناڵ ووتی،

– باش بوو لێرە بووی ، هەتا لای ئۆتۆمۆبیلی فریاکەرەکە لەگەڵم
وەرە ، دەستت لەسەر نیوچەوانم دابنێ وەختە مێشکم ببرژێتە .
منیش هەستامە سەرپێ و دەستم خستە سەر نیوچەوانی و هەتا
دەرەوە لەگەڵی چووم . هەر لە دەرگای ژوورەکەی بەڕێوەبەر
چووینە دەرەوە ، دەتووت قەت نەیزانیوە نەخۆشی چی یە و بە
ئەسپایی پێی ووتم !

– دیارە بەڕێوەبەرەکەمان دەناسیت ؟

ووتم !

– بەڵێ دەیناسم .

ووتی !

– کەواتە تۆش لایەنگیریم بکەو بڵێ ماوەیەکە تووشی نەخۆشی دڵ و
باڵەپەستۆی خوێن بووەو لەسەر مردنە .

زۆر سەیرم بە قسەکانی هاتە ، لەوەتی دەیناسم نەمزانیوە
ڕۆژێکە لەڕۆژان مووچە خۆری میری بوو بێتە ، لێم پرسی !

– چما دامەزراوی ؟!

ووتی :

ـ جارێ لێم گەڕێ دووایی خۆم هەموو شتێکت پێ دەڵێم .

گەڕامەوە لای بەڕیوەبەرو دانیشتمەوە. بەڕێوەبەر پێی ووتم :

ـ ئەم سەعیدە لەکەیەوە دەناسیت ؟

ووتم :

ـ لەزویکەوە دەیناسم .

بەپێکەنینەوە ووتی:

ـ تۆش وەکو من دەیناسی .؟

ووتم :

ـ چۆن ؟

ووتی :

ـ ئەم سەعیدە ڕێوی یێکی فێڵبازە ، تەماشای ئێستا مەکە وا بە غەریبی دێتە پێش چاوان ، شەیتانت بۆ لەخشتە دەبات ئەگەر بڵێ خوا بەخەقە دەنا قەت پێی بڕوا ناکەم ، هەموو لەشی ساختەیە ، لەگەڵ دەروونی خۆی درۆ دەکات .

سەرباری ئەوەش ئێستا زگم پێی سووتاوەو یارمەتیشم دا .

هەرچەندە ئێستاش هەر ناچێتە ئەقڵمەوە ، بەڵام دەڵێی چی قەحپەبابی وا خوا بەهرەیەکی ئەوتۆی داوەتێ هەموو دەورێکی لێ دێت !!

بۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر بە بەردەرگای ماڵی سەعید گوزەرم کرد . بینیم سەعید زەبۆکە کۆڕێکی بەستووە ، پێکەنین و بەزم و ڕەزمی ڕۆژە ڕێ بەکە دەڕوات . دەتووت سەعیدی جارانیش نی یە ، ڕیشی تەراش کردبوو و جەمەدانی و کۆنە قاپووتەکەشی فڕێ دابوو. زۆر مەراقی ساغ کردنەوەی ئەم ڕاستی یە بووم . چوومەلای ، هێشتان قسەم نەکردبوو لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :

ـ توخوا چۆن بووم ؟ لێم دەهاتە یان نا ؟

منیش ووتم :

ـ نەخوش بەکە ؟

ووتی : نواندنەکە !!

ووردو درشتە مەسەلەکەی بۆ گێڕامەوە، گوایا چەند ساڵێکە لە دایەرەی ئەلبان بە ئێشککری شەوان دامەزراوەو بەڕۆژیش لە دوکانەکەی خەریکی کەلاش دروست کردنەو دوو دەزگای تری کەلاش دروستکردنیشی لە ماڵەوەو لەدایەرەکەی داناوەو لەکاتی چوونە ماڵەوە یان چوونە سەر کاری بۆ دایەرە کەلاش دروست دەکات.

کەوتە پاڕانەوەو نووزانەوە دەتووت هەتیوی هەیە دەیووت:

- گوزەران بەزەحمەت کەوتووە، هەموو شتێ نرخی بۆتە دووقات ئەگەر وانەکەم گوزەرانم ناسووڕێت.

هاتە سەر باسی دامەزراندنیشی لەدایەرەی ئەلبان و ووتی:

- پارە هیچ بایەخی نی یە، با ملیۆنێریش بیت، هەمووی پەنجا دینارێ تەقاویتی نابینێ کە ژیانی مرۆڤ مسوگەر دەکات و هەتا مردن نابڕێت.

دوایش هاتە سەر باسی ساختەی خۆ نەخۆش کردنەکەی و ووتی:

- خۆ شوکور هیچ نەخۆش نیمە، بەڵام ئەگەر ئەوهام لەخۆم نەکردبا، ئەوا بەڕێوەبەر پێمی بڕوا نەدەکردو بڕیاری لیژنەی تەندروستی تەمیز دەکردەوە. خۆشت دەزانی منیش هێزی جارانم نەماوەو چی تر توانای ئێشککری شەوانم نی یە ئەگەر بەهۆی تەندروستی یەوە نەبێت جارێ دەساڵی ڕێکم ماوە بۆ تەقاویت بوون. ئەوەش زۆرە و قەت بەمن تەواو نابێت. بۆیە هەستام بیرم لەم فێڵە کردەوەو دەستە جلێکی مەوزم بۆ قەڕاشی سەرۆکی لیژنەی تەندروستی بە دیاری برد و داوام لێ کرد کە بە دکتۆرم بناسێنێ و بەخزمی خۆیم لەقەڵەم بدات. ئەوە بوو بەڵێنی ئەوەی دامێ و ناوی خوام لێ هێنا.

پێکەنینم بەقسەکانی هات. لەبیری خۆم ووتم: (ئەگەر دەرچوون لەوەزیفە بەهۆی تەندروستی یەوە ئەوەها ئاسان بێت ئەوا نیوەی فەرمانبەرانی دەوڵەت بەو ڕێگایە خۆیان خانەنشین دەکەن.

منیش یەکێک لەوانە دەبم ! ).

هەمووی چەند ڕۆژێکی نەبرد ، سەعید زەبۆکم بینی بیەوە ، هەر لەدوورەوە نووسراوێکی لەباخەڵی دەرهێنا و پیشانی دام ، کە خوێندمەوە تیایدا لیژنەی پزیشکیی بڕیاری خانەنشینکردنی سەعیدیان دابوو بەهۆی نەخۆشیی و پلەی پەککەوتنەکەشیان بۆی لە سەدی سەد دانابوو !! .



# سەعید زەبۆك دەگاتە لای پارێزگارو پارچە عەردێكی بەخۆڕایی لێ وەردەگرێ

بەری چەند ڕۆژێك بوو ، دووەم پیشانگای هونەری شێوەكارم بە سەرپەرشتی پارێزگار كردبۆوە . پسوولەیەكی دابوومێ كە دوای تەواوبوونی پیشانگایەكە سەردانێكی بكەم و بەخشیشێكی لێ وەربگرم. دوای تەواوبوونی پیشانگایەكەم ، سەر لەبەیانی زوو چوومە تەشریفی جەنابی پارێزگار. لەسەر كورسی یەكەی بەرامبەری دانیشتبووم . بەدوای فەڕاشەكەی دا ناردو نووسراویكی دادەستی و پێی ووت :

- بڕۆ لای بەڕێوەبەری دارایی ، ئەم پارەیە بۆ ئەم هونەرمەندە سەرف بكاتەو لەگەڵ دەستی خۆشت بۆی بهێنەوە .

ووردە ووردە نووسراوەكانی بەردەمی خۆی ئیمزا دەكردو ناوە ناوەش ئاوڕێكی بۆ لای من دەدایەوەو یەكە دوو قسەی ئەلەقەو بەلەقی لەگەڵ دەكردم .

لەوكاتە سكرتێرەكەی هاتە ژوورەوەو دوو شریتی ڤیدیۆی لەسەر مێزی پارێزگار داناو ووتی:

- جەنابە وێنەگرەكە هاتۆتەوەو ئەم دوو شریتەی تریشی بۆ جەنابتان هێناوە. یەكی سەعاتو نیوێكەو گشت لەقتەی فلیمە تەلەفزیۆنی-یەكانی تیایە كە زیارەتەكانی جەنابتی نیشان داوە لەماوەی شەش مانگی ڕابردوودا .

پارێزگار لەخۆشی یان قوونە تۆتكەی بوو ، خۆی بۆ نەگیرا بانگی كردە ژوورەوە .

دەبینم دیسان سەعید زەبۆكی لەمەر كەرەكەی خۆمانە ! ئەم قورمساغە لەهەموو جێیەكە ئەسكووە. سەعیدو وێنەگری كوچە مەرحەبا !! نازانم چی ئەم زۆڵەی گەیاندە لای پارێزگار ، كە چاوی بەمن كەوت ، ڕەنگی تێك چوو ، بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا،

بەچاو قایمی لەسەر کورسی یەکەی بەرامبەرم دانیشت ..هەر بەسەر خۆشی نەهێنا ، کە ڕۆژێکە لەو ڕۆژان منی ناسیوە یان دەمناسێتە .
منیش وەکو ئەو خۆم تێی نەگەیاندو دیقەتی ئەم کەڵەکاتە نوێیەییم کرد . پارێزگاریش هەر شریتەکانی سەروبن دەکردو دەیووت :
- پێم نالێی تۆ ئەم بەهرەیەت لەکوێ هێنا ، ئەم زەوقەت چۆن هەیە شەوو نیوەشەوو ڕۆژانی هەینی و پشووی ڕەسمی لەبەرامبەر تەلەفزیۆن دابنیشیت و ئەو فلیمانەی کەدەنگ و باسی منی تیام تۆماری بکەیت ؟!
ئەویش بەزمانی لووسەوە دەتووت برای لەدایکەو باوکی یەتی خۆی کردبووە جەرگە سۆزی ئەوو دەیووت :
- جەناب بۆتۆ هیچ بە خەسار ناچێ . تۆ چۆن شەونخونی بە شێوکاری ئێمەوە دەکەی و بۆ بەرژەوەندی و خۆش گوزەرانی ئێمە هەست بەماندوو بوون ناکەیت ، منیش ئەوها بۆ تۆمارکردنی زیارەتەکانت ، هیچ هەست بە ماندووبوون ناکەم . بەڵکو جۆرە ئارەزوویەکەو خووم پێ یەوە گرتووەو ناتوانم بەبێ تۆمارکردنی بخەوم .
شای لەم ساختەچی یە ، لەحەوت شاوی داوەو قاپی تەنی نەبووە . کەس نەماوە نەی تراندبێت !! حەقی حاجی حوسێن نەبوو ملێ ئەم مردوو نەمرە شەیتانیشت بۆ لەخشتە دەبات !
پارێزگار بانگی سکرتێرەکەی کردو ووتی :
- لەگەڵ کاک سەعید برۆ بۆلای بەرێوەبەری دارایی و دووسەد دیناری بەخشیش بۆ سەرف بکەن .
سەعیدی مەکرباز یش خۆی کردەووە فریشتەی خواو بەدرۆ دەیووت :
- جەناب زۆر عەیبە بۆ من پارە وەربگرم . من ئەم فلیمانەم بۆ پارە تومار نەکردووە . ئەگەر بۆ پارەبێت بۆ هەموو سامانی جیهان ئەوێکە شەونخونی ناکەم .
ئێش ئەوەی بیستە دەرەوە ، سنکالایەکی لە باخەڵ دەرهێناو لە

## چونمان بۆ موسڵ بۆ كڕینی عەردی    دكتۆرێكی ئەوێ



لەبەر بچوکی ژوورەکان و نەبوونی مەتبەخێکی ڕۆژئاوایی و بچوکی باخچەکەمان ناچار بووم خانووەکەم بفرۆشم و بەدوای پارچە عەردێکی گەورەتردا بگەڕێم .

زۆر گەڕام و سوڕام هیچ پارچە عەردێکی هەرزان بەهام لە گەڕەکەکەی خۆمان بەدەست نەکەوت . ئەو پارەو پوولەی بەدەستمەوە بوو پارچە عەردێکی تۆزێکە لەعەردەکەی خۆم گەورەتری پێ نەدەهات . نرخی عەرد بەرز ببۆوە ، جاران پێش ساڵێک کەس مەتری بە چل دینار نەدەکڕی کەچی بەختی من بەرز بۆوە بۆ حەفتا دینار . ڕۆژێک بەدوای پارچە عەردێک دەگەڕام ، چەند نووسینگەیەکی کڕین و فرۆشتنی زەوی و زارم بەسەر کردەوەو ناوی خۆم لەلای هەموویان نووسی بۆ کڕینی پارچە عەردێک . لەنووسینگەی مام ڕەسول دانیشتبووم ، باس باسی بەرزبوونەوەی نرخی زەوی و زار بوو . لەوکاتەدا سەعید زەبۆکە هاتە ژوورەوەو لەبازاری زەوی و زاری دەپرسی . دیار بوو زۆر هاتووچۆی ئەم نووسینگەیەی کردبوو بۆیە لەگەڵیان یەک ماڵ بوو و بەسەربەستی لەناویدا دەخولایەوەو دەفتەری ناو نووسینگەکەی هەڵدەدایەوە .

سەر لەئێوارەی هەمان ڕۆژ بەبەر دەرگای ماڵی سەعید ڕەت بووم ، بانگی کردم و ووتی :

ـ دەڵێی خەریکی کڕینی عەردی ؟

ووتم :

ـ نیازم وایە ، بەڵام پارەکەم هیچی پێ نایەت . ئەگەر ئەو پارەی بەدەستمەوەیە هەمووی بەعەرد بدەم ئەوا هیچم لەدەستە نامێنێتەوە خانووی پێ بکەم .

لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :

ـ هەی لەمنت نەکەوێ ، ئەدی من چیمە لێرە ! لەگەڵ خۆم عەردێکت بۆ دەکڕم مەتری بەسی دینار .

پێکەنینم بەقسەکەی هات ووتم:
- سەعید تۆش دەتەوێ پێمان ڕابوێری ؟!
زیاتر هاتە پێشەوەو دەستی خستە سەر شانم و ووتی :
- برا گەورەیتە ، چۆن گاڵتەی وات لەگەڵ دەکەم . لەگەڵ تۆش نەبێ لەگەڵ کەسی تر شەراکەتی وەها ناکەم .
زیاتر لەسەری ڕۆیشت و ووتی:
- ئەگەر باوەڕیش ناکەیت لەگەڵم وەرە هەر لەپشتەوەی خانووەکەی خۆت پارچە عەردێکی هەزارو دووسەد مەتری هەیە بەیەکەوە دەیکڕین .
ووتم :
- دەزانم هەیە ، بەڵام کێ دەڵی خاوەنەکەی بەو نرخە دەمان داتێ؟
ووتی :
- تۆ حەقت نەبێ ، بەیانی خۆت بگۆڕەو بەیەکەوە دەچین بۆ موسڵ . من هەرچیم ووت تۆ بۆمی تەرجەمی عەرەبی بکە ، بەڵام پێکەنینت نەیەت ؟!
سەیرم لەقسەکانی سوڕما ووتم :
- موسڵ بۆ ؟
ووتی :
- خاوەنی ئەو پارچە عەردە دکتۆرێکی موسڵاوی یەو شوێنەکەی لە بابول تۆبە جارێکی تریش چوومە بەس لەوێ نەبوو .
هەندێک بیرم لەقسەکانی کردەوە و نەچووە ئەقڵم . فێڵ و تەڵەکەبازی و ساختەکانیم هاتنەوە بەرچاو لەبیری خۆم ووتم (ڕەنگە بێت بم باتە سەرزێ و بە تینوێتی بمهێنێتەوە، مەگەر ئەمجارەش ڵۆینێکی تری لەژێر سەر نەبێت ) لێکدانەوەی مێشکی خۆم کرد، بێ سوود بوو . سەرەڕای ئەوەش بڕیارم دا لەگەڵی بچمە موسڵ . لەبیری خۆم ووتم (هەر هیچ نەبێ بەگەشت و گوزەری دادەنێم و هەندێک کەل و پەلی پێویست لەوێ دەکڕم).

بۆ بەیانی ناوی خوامان لێ هێناو بەرەو موسڵ کەوتینە ڕێ .
لەناو ئوتومۆبیلەکە پێم ووت :
- تۆ ئەو دکتورەت چۆن ناسی و چۆن زانیت ئەو عەردە هەی ئەوەو دەیفرۆشێ ؟
بەپێکەنینەوە ووتی :
- براکەم . ئەو ڕۆژەی هاتمە نووسینگەی مام ڕەسوول بۆ کڕینی عەرد . ئەی نەتەبینی دەفتەری ناوەکانم هەلدەداوە ؟
لە ناو دەفتەرەکە ئەم زانیاری یانەو ناونیشان و نمرەی تەلەفۆنی دکتورەکەم دەرهێنا .
لەدەمم دەرچوو ، بەدەنگێکی گەورە ووتم :
- هەی ساختەچی ، ئەیتان ڕێ بەمە نابات چۆن ئەمەت زانی ؟!
بەتووڕەیی یەوە ووتی :
- چۆن بەمن دەڵێی ساختەچی ؟ ئەمە زیرەکایەتی یە ، ئەی وەکو تۆ باشە خۆت فەقیر حاڵ کردووەو ئەو دەلالە قۆڵبڕانە دەتبڕنەوە .
- بەهەزار حاڵ هەتا دڵیم داوەتەوەو ئاشتم کردەوە . گەیشتینە جێ هێشتان دکتور نەهاتبوو ، پێش ئەو گەیشتینە عیادەکەی لە ساڵۆنەکە دانیشتین . ڕووی تێ کردم ووتی :
- ئەم ئیشەی ئێمە پرۆفەیەکی دەوێ ، هەتا لێمان تێکەنەچێ و دکتوریش پێمان باوەڕ بکات . بۆیە من چیتە پێ دەڵێم بۆ عەرەبی بگۆڕەو هیچ مەپرسە بۆ و لەبەرچی ؟
بەپێکەنینەوە ووتم :
- پرۆفەی چی ؟! خۆ ئێمە تەمسیل ناکەین . ئەو دکتۆرە عەرد دەفروشێتەو ئێمەش کڕیارین . هەموو دوو پرسیارە ، عەردەکەت دەفرۆشی یان نا و بە چەند ؟!
پڕ بەدەم جرتێکی کێشاو ووتی :
- تڕحێو ! بەخۆشت دەڵێی ڕۆشنبیر !! ئاخر هەرواتە کردووە بۆیە

نەبوویتە خاوەنی هیچ . دەتەوێ ئەم عەردەش وەکو عەردەکەی

لەمەڕ عەبدول ستار لێ بکەیت . ساڵێک بوو پێی دەووتم ،

دینارێکم بۆی زیاد نەکرد ، تۆ بە ڕۆژێک دوو دینارت بۆ

زیاد کرد .

ووتم :

ئەوەی چوو چوو با هیچی تر لەدوو چوان نەچین . با بێینەوە

سەر باسی عەردەکەی دکتۆر . من عەردەکەی دکتۆرم بینیوە، لە

تەنیشت عەردەکەی ئەو عەردی مامۆستایەکە مەتری داوای حەفتا

دینار دەکات بەڵام ڕووبەرەکەی لەهی دکتۆر کەمترە. باشەوەی

دکتۆریش حەفتا نەیەنێ لەبەر زۆری ڕووبەرەکەی ، خۆ هەر هیچ

نەبێ داوای شەست دینار دەکات .

سەری خۆی لەقاندو ووتی:

- من دەڵێم نێرە ، تۆ دەڵێی بیدۆشە ! ئەی لەدوێنێ وە چی دەڕێسم؟

تۆ ناتەوێ مەتریی بەسیی دینار لەژێر چنگی دەربهێنم ؟

قەناعەتم بەقسەکانی نەهات و ووتم :

- گوایا ئەم ئەمادەیەی بەخۆڕایی وەرگرتووە ؟!

ووتی :

پەیوەندی بە زیرەکی و چاپووکی یەوە نی یە. ئەم دکتۆرە بیست

ساڵ لەمەوبەر مەتری ئەم عەردەی بە پەنجا فلس لە بنەماڵەی

سەلافەندی کڕیوەو هەر لەوکاتەوە چاوی بە هەولێر نەکەوتووەو

ئەگەر بێتیش نایدۆزێتەوە. سەرم سوڕما ، ئەو هەموو زانیاری-

یەی لەبارەی دکتۆرەوە چۆن بەدەست گەیشتووە ! ئەگەر

دایەرەی ئیحصاش بوایە ئەمەی پێ نەدەکرا . نازانم ئەم

سەگبابە ئەم بەهرەیەی لەکوێ بۆ ماوەتەوە. بیەوێتە یەکێکە

بتـرپێنێ زانیاریی لەسەر خۆی و چوار پشتوی کۆدەکاتەوە .

لەوکاتەدا دکتۆر گەیشتەجێ .

دکتۆرێکی بەساڵاچووی پیری ئەت و گێڕی چاوکز ، چاویلکەیەکی

پزیشکی لەچاو کردبوو ، وا پێ دەچوو گوێ یەکانیشی گـــران بووبێن بۆیە سەماعەی لەناو گوێی دانابوو، چووە جێی خـــۆی دانیشت و جەرەسی لێدا ، بانگی فەراشەکەی کردو پێی ووت :

ـ بابێنە ژوورەوە .

چووینە ژوورەوە ، هەردووکمان لەتەنیشت یەک لەبەرامـــبەری دانیشتین . دوای سڵاوو رێز ، سەعید رووی لەدکتۆر کردو بەزمانی کوردی ووتی :

ـ دکتۆر هاتووینە عەردەکەی هەولێرت لێ بکڕین ؟

دکتۆریش سەری خۆی لەقاندو ووتی :

ـ أحچی بالعربي ما أفتهم ؟

سەعید رووی لەمن کردو ووتی:

ـ بۆی بگۆڕە سەر زمانی عەرەبی ؟

ئیتر ئەوەبوو سەعید دەستی پێ کردو منیش باش و خراپ چـــی چی دەووت بۆیم دەکردەوە عەرەبی . قسەی وای دەکرد سەر بە هەش پێی پێ دەکەنی . هەتا بۆیم وەرگێڕا سەر زمانـــی عەرەبی هەمـــوو لێوەکانی خۆم لەتاوان کرۆشتەوە. لەتاوان وەخت بوو وەکە دەبێ دەبە بتەقم . دەیووت :

ـ پیاوێکی هەژارم ، چەند سەر مەڕێکم هەیە لەگەڵ ڕەشماڵـــێکە لەدارەتی دونیا لەوەندە زیاتر هیچی تر شک نابەم . خاوەنـــی دەسەر خێزانیشم ، گوزەرانم زۆر زەحمەت بووەو لەناو شاریش لەوەڕگا تەماوە ، شارەوانیش تەنگی پێ هەڵچنیوم و لێ ناگەڕێ مەڕەکانم بە ئارەزووی خۆم بلەوەڕێنم . زەوی یەکەی تۆش بۆ لەوەڕگا زۆر باشە ، کەوتۆتە دەرەوەی شارو شوێنەکەی چاڵـــەو ئاوی باران و چڵپاوی شاریشی دێتەوە سەر ، بۆیە ساڵ وەخـــتی ساڵ سەوزەگیای لێ نابڕێتە . منیش دەمەوێ ئەو پارەو پوولـــەی هەمە بەو عەردەی تۆی بدەم و ڕەشماڵێکیشم هەیە لەنـــاوی هەڵدەم و لەدەستی کرێچی باتیش ڕزگارم دەبێت .

دکتۆرەکە ئەبڵەقە ببوو ، دەمی بەتێکە بەش کردبۆوە، لەگەڵ وەرگێڕانی هەر دێڕێکە لەو قسانە ، موچرکێکی ساردی بەلەشدا دەهات ، گوێ یەکانی وەک کەروێشکە قیت کردبۆوە، لە سەر سامیان چاوەکانی زەق کردبۆوە، کەلە قسەکان بووینەوە دڵی لەخۆ چوو و پشتاوپشت بەکورسی یەوە بەربۆوە !! هەندێکە ئاومان بەدەم و چاوی داکردو بەتوندی بانگمان کرد، دکتۆر ... دکتۆر ... بەهەزار ناڵەی عەلی هەتا بەخۆی هاتەوەو هەستاوە سەرپێ . سەعید زەبۆکیش هەر لەسەر پیکی خۆی بوو ، ڕووی لە دکتۆر کردەوەو ووتی :

دکتۆر بۆ فرۆشتنی عەردەکەت چی دەڵێی ؟

دکتۆریش بە نقەنقەو جقەجقە هاتە وەلام و ووتی :

– ماقولە ئەمە بیست ساڵە شاری هەولێر نەگەیشتبێتە لای عەردەکەی من ؟!

ئەویش بە پێکەنینەوە ووتی:

– بە بیست ساڵی تریش شار ناگاتە ئەوێ ، بۆیە من مەراقنم لێی داوەو دەمەوێ بیکەمە لەوەڕگا .

هەرچەندە ئەم سەعیدە وەکو ڕێوی وایە ، فڕوفێڵی لەبن نایە بەلام موسلاوی لەو ڕێوی ترن . هەروەکو پەندەکەی لەمەڕ خۆشی یان دەڵێ (هاموشۆی ڕێوی یان بکە بەلام هاموشۆی موسلاوی یان مەکە !) ئەمە ڕاست دەرچوو . دکتۆرەکە سەرەڕای پیری و پەک کەوتوویی لەسەعید زەبۆکە زۆر زان تر دەرچوو . هەرچەندی هەوڵ و تەقەلامان لەگەڵی دا کەنرخێکە بۆ فرۆشتنی عەردەکەی دابنێ هەتا ئێمەش قسەیەکی لێوە بکەین . بەلام ئەو نقەی لێوەنەهاتەو چەند بەرد هاتە وەلام ئەویش هەر ئەوەندە .

ئاخیری ووتمان :

– تۆ ئەم عەردەی خۆت دەفرۆشی یان نا ؟

ووتی :

ـ دەیفرۆشم .

ووتمان :

ـ کەواتە بلێ بەفلسێک !

ووتی :

ـ ئەو زانیاری یەی ئێوە لەبارەی عەردەکەمەوە باستان کرد ، ڕیسی لێ کردمەوە خوری . من باش لەعەردەکەم گەیشتبووم بۆیەپەسام ڕەسوولم ووتبوو بەنرخێکی باش بۆم بفرۆشێ . ئێستاش ئێوە عەردەکەتان لێ کردمە کەری تۆپێ و هەرچەندی پێی بدەن خەسارەو ناهێنێ .

سەعید بەم قسەیە دڵی خوش بوو ، خۆی پێ نەگیرا ، یەکسەر کیسەیەک بیست و پێنج دیناری دەرهێناو ووتی:

ـ مەتری بەسێ دینار بۆمن . با خەسار بێت ، من بۆ لەوەڕگامەم خۆ بۆ دروست کردنی قەسری زەورم نی یە !!

دکتۆر سەرێکی هێناو سەرێکی برد ، ئاخیری بڕیاری لەسەر ئەوەدا کەزیارەتێکی هەولێر بکاتەو لەگەڵ ڕووپێوی تاپۆ عەردەکەی بەسەر بکاتەوەو پرسێکی نرخی عەردی دەوروبەری عەردەکەی خۆی بکاتە ، ئەوکاتە وەعد وەعدی پیاو بێت مەتری دینارێکیش لە خەڵکی تر عەردەکەی بفروشێتەوە ئێمە . کەوای ووتە سەعید زەبۆکە بێ هیوا بوو ، زمانی خۆی گەستەوەو ڕووی لەمن کردو ووتی :

ـ نیشەکەمان فتە !!

هەرچەندە زۆرم بەلاوە ناخۆش بوو کەمایە پووچ مابینەوەو ماندوو بوونمان بەفیڕۆ چوو کەچی سەرەڕای ئەوەش زۆرم پێ خوش بوو ئەوجارەیان فێڵەکەی سەری نەگرتە !

هەستابینە سەرپێ و خواحافیزیمان لەدکتۆر کرد . پێش ئەوەی بچینە دەرەوە ، سەعید زەبۆکە داوای لەدکتۆر کرد کەکارتۆنێک شیری بلارکۆنی بۆ بنووسێتە بە بیانووی ئەوەی گوایا دوو منالی

جمکیان تازە بووەو یەکێکی تریشی هێشتان هەر شیرەخۆرەیەو ژنەکەشی لەسەر جێ کەوتووەو کەس نی یە بەخێوی یان بکات .
ئەوەبوو دکتۆر پسوولەیەکی بۆ نووسی و لەژێرەوەی عیادەکەی دکتۆر دەرمانخانەیەک هەبوو کەهی ژنی دکتۆرەکە بوو ، پەک کارتۆن شیری بلارکۆنی وەرگرت .
خوا نەبێت کەس سەری لەم عفریتە دەرناچێت ! ئەمەشی شوێنێکی ترە ، مەگەر دۆڕاندنی عەردەکەی پێ پڕنەکاتەوە !
پێم وت :
- سەعید کوا منالی شیرەخۆرەتان هەیە ؟!
لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :
- پەلە مەکە هەموو شتێک هۆی خۆی هەیە . جارێ بەس تەماشا بکە ، دوایی دەزانیت مەگەر سەعید نەبم ! چۆن لێی دەگەڕێم زەرەر بکەم ؟!
هەندێک دوور کەوتینەوە ، کارتۆنە شیرەکەی بەچوار قاتی خۆی فرۆشتەوەو پارەکەی خستە تەنکەی باخەڵی . بەسەرسوڕمانەوە ووتم :
- ئەوە چی یە ؟
ووتی :
- ئەی چۆن ، نابێ خەرجی هاتووچۆم دەربێتە ؟!

# چۆن دوکانەکەی بەبێ مۆڵەت تەواو کرد

نیوەی خانووەکانی گەڕەکی موفتی لەلایەن سەعید زەبۆکەوە دروست کرابوون بۆیە زۆرکەس ناوی گەڕەکەکەی ئێمەی بە سەعیداوە دەبرد . وەکو بڵێی لەم دوا دوایی یەدا سەعید هەستی بەوە کردبێت کەخانوو فرۆشتن ڕەواجی نەمابێت لەبەر کەم بوونەوەی عەردی فرۆشتن و بەرزبوونەوەی نرخەکانی یان و نرخی کەرەستەی خانوو و کرێی کرێکارو زۆر تەنگەو چەڵەمەی تر . بۆیە ماوەیەک بوو بەدوای ئۆینێک دەگەڕا کە بە هۆی ئەوەوە نانێکی چەوری دەست بکەوێ .

پیاوێکی زۆر ماندوو شەکەت بوو و نەیدەزانی حەسانەوەو دانیشتن چی یە ، شەووڕۆژ لەکارکردن و کەسابەتدا بوو . سەرێکی هەبوو سەد سەودا . بەقەد جوێکی هەبوو ئەگەر بشت دیتبا زکت پۆی دەسووتاوەو خێرت پێی دەکرد .

هەموو دەمێک دەکڕوزایەوەو دەنووزاوە ، لەباسی پارەو دراو زیاتر هیچی تری لەسەر زار نەبوو .

بەیانی یەکی ڕۆژی هەینی بەلای مالی سەعید دەهاتمە خوارەوە بینیم دەستەیەک کرێکار بە قازمەو خاکەناس خەریکی حەوشەکەی سەعید زەبوکن و دەیهێننە خوارەوە .

هەندێکی تریش خەریکی بڕینەوەی دار پرتەقاڵ و هەرمێکان بوون . کەدیمەنی ئەو دارپرتەقاڵ و هەرمێ یانەم بە براوی بینی کەللەم بۆیان دەتەزی .

ئۆنێکم هەڵکێشاو لەبیری خۆم ووتم (یەکو دەڵێی ئەو پیاوە خلاڤاوە ، بۆچی ئەو حەوشە جوانەو دارە نایابانەی بەرداوە ؟! ).

هەتا چوومە بازارو هاتمەوە ، ئەوجارەیان بینیم لەشوێنی ڕووخاوەکە ژووریکی خنجیلانەی لێ بەرزکراوەتەوەو دەرگایەکیشی لەدیوی دەرەوە تێ گیراوە .

چوومەلای ووتم: دەتەوێ ئەم ژوورە بچووکە بکەیتە چی ؟
زۆری لەسەر ڕۆیشت ووتی: خەرجی گرانە ، کیلۆی مریشک بە
دینارو نیوێکە ، هی گۆشتی ئاژەڵیش بەپێنج دینارە ، دەستەی
هێلکە دوانزە پەنجایی ... مەنجەڵێکی ماست کەبەشی یەک
ڕۆژ بکات بەدوو دینارە .
ووتم: مەبەستت چی یە ؟
ووتی: نیازم وایە ئەم کۆڵیتە لەم قوژبنە دروست بکەم وهەندێک
مریشک و ئاژەڵی تیا بەخێو بکەم .
هەر ئەو ڕۆژە دەستەیەک کرێکار بەسەر دیوارەکە کەوتن و
دار سپیندار یان لەسەر دیوارەکان ڕایەڵ کردو بەتەبەقەی جەمە -
لۆنیش دایان پۆشی و دوای خۆڵەبان خەفتەیەک کۆنکریتی یان
لەسەر گرتەوەو سەبیان کردە لەدیوی ناوەوەی ژوورەکەش دوو وەستاو
چوار کرێکار خەریکی لەبخ کردنی دیوارەکان بوون . نەگەیشتە ئەو،
دەستەیەکی تری کرێکاران بەگورجی بەدوو سێ خەفتە عەردی
ژوورەوەیان کۆنکریت کرد .
هەرچەندی بیرم لێ دەکردەوە سەرم لێ دەرنەدەکرد، لەبیری خۆم
دەمووت (دروست کردنی کۆڵیتێکی وا ئەم هەموو پەلەیی و سەین و
بەینەی بۆچی یە ) ، چوومەلای و لێم پرسی:
- سەعید ئەگەر کەس نەتناسێ من دەتناسم بایی چەندی !
هەر بەخۆم دەتناسم چ ماڵێکی ، چیتان بەشەیتانێتی خەڵکی
لەدەستی تۆ ڕزگار نەبووە . بەڕاستی پێم بڵێ ئەمەت بۆچی یە ؟
لەقاقای پێکەنینی داو ووتی: بەسەری منداڵەکانم ئەگەر نیوسەعاتە
پێش ئێستا ئەم . پرسیارەت لێ بکردبام بەڕاستی وەڵامم
نەدەدایتەوە ، بەڵام ئێستا بێ ترس و بەڕاستیش وەڵامت دەدەمەوە .
بەسەر سوڕمانەوە ووتم:
- بۆ ؟
ووتی :

# چۆن خۆی دەکاتە وەکیلی کۆمپانیای جگارە لەهەولێر

سەعید زەبۆک کلکی لەهەموو شوێنێکدا دەجوولێتەوە ، هەر ڕۆژی لەدا بەرەیەکە . هەر کاروکاسبی یەک خێری پێوەبێت وەکو پشیلە بۆنی دەکاتەو خۆی دەکەیەنێتێ .
هەفتەیەک زیاتر بوو لەگەڵ مام مەحەمەد یەکی فایلێکی یان خستبووە بن هەنگڵ و لەڕێگای کارگەی جگارە دەهاتن و دەچوون .
بە مام مەحەمەدم ووت !
ـ دەڵێی لەگەڵ سەعید شتێکتان بەدەستەوەیە وا بەیەکەوە گونجاون و خەریکن ؟!
بە پێکەنینەوە ووتی!
ـ خوا خێری بنووسێ ، ئاگام لەهیچ نەبوو، ئاگاداری کردمەوە کە کۆمپانیای جگارە نیازی وایە وەکالەتی فرۆشتنی جگارە بداتە ئەوکەسانەی مەرجەکانی ئەو وەکالەتەیان تیا هەیە .
زۆرم زگ پێی سووتا ، لەوە دەترسام فیتنەیەکی لێ بقەومێ ئەگینا ئاگادارم دەکردەوە کە ئاگای لەخۆی بێت نەبادا بیفرۆشێتەو بەخۆشی نەزانێ هەروەکو چۆن منیشی بەدوای خۆی دا بۆ موسڵ برد ئەوەی فلسێکی قەڵپی لێ قازانج بکەم .
ئەم ساختەچی یە خوا بەهرەیەکی وای داوەتێ ، گیاتە بۆ دێنێتە چنۆکان و هیچیش نی یە . منەتێکی بەخۆڕایی هەڵدەگرێت و زۆر مەمنونیشی دەبێت و لەسەر حسێبی تۆ خەڵێک چاکەو پیاوەتیش دەکاتە بۆ ئەوەی هیچیشتە بۆ بکات . سەلام بەکێ دەڵێی ؟! ئەوەی نەکەوێتە ناو تۆڕی ئەم ڕێوی یە باوەڕناکاتە ، پاشی ترێش خەپشەی برێ !! دانم بەخۆم دا گرتەو ئەوەی لە دڵم دابوو لەدڵی خۆمم هێشتەوە بەچاکەو بەخراپ ئامۆژگاریم نەکرد .

چەند مانگێک بەسەرچوو ، ڕۆژێک بە بەردەم دوکانەکەی مام مەحەمەد ڕەت بووم ، سڵاوم لێی کردو وەری گرتەوە . جگەرە خۆرێک لەلای دانیشتم . هەر پرتەو بۆڵە بۆڵی بوو و لەبەر خۆیەوە دەیوت !

ـ سەگی سەگ بابی وا ، دوو مانگە زیاتر لەئیشی کردم وەمەسرەفی تاکسی و بەرتیل دان و دەعوەتەو دەعوەتە کارن و پارەی دیاری و پوول و سکاڵای پێ دام و وەکو کوچ کوچەش منی دایە دوای خۆیەوە لەو دایەرە بۆ ئەو دایەرەو لەو گەراج بۆ ئەو گەراج ، چی یە وەکالەتی پاکەتە فرۆشتن بەجوملە بۆ خۆی و بۆ من دەردێنێ . لەدواییشدا وەکالەتەکەی تەنیا بۆ خۆی دەرهێنا ، دەڵێ چی یە ، وەڵا تەنیا یەکە وەکالەتی یان دەوێ !!

منیش ووتم !

ـ چۆن وەکالەتەکەیان بەس دا بە ئەو ؟

ووتی !

ـ کێ بزانێ ئەو ڕیوی یە هەموو زانیاری و یاساکانی ئەوانی ئەزبەر کردووەو بەتاکە مەرجێک هەموو مەرجەکانی ئێمە دەداتە لاوە !!

سەرم لە مەسەلەی ئەو تاکە مەرجەو مەرجەکانی تر دەرنەچووە ، ڕووم تێی کردو ووتم !

ـ لێت حاڵی نەبووم ، تکایە زیاتر ڕوونی بکەوە ؟

بەدرێژی لەسەرەتاوە هەتا دوایی مەسەلەی وەکالەتەکەی بۆ گێڕامەوە ووتی !

ـ منی بەدوای خۆی دا ، هەموو بازاڕی پێ گێڕاکردم . چەند گەراجی گەورە هەیە هەمووی بەسەر کردۆتەوە بۆ بەکرێ گرتنی دوو گەراج ، یەکی یان بۆ من و ئەوی تریشیان بۆ خۆی ، منیش دیچم لێ نەدەزانی و لە مەبەستی نەدەگەیشتم دەیەوێ چی بکات و پێشی نەدەووتم . ئەگەر لێشم بپرسیبا دەیووت !(تۆ

بەس لەگەڵم وەرەو تەماشا بکەو هیچ دەنگە مەکە.) ئەوەبوو لەگەڵ دوو خاوەن گەراجێ رێکە کەوت بۆ بەکرێ گرتنی گەراجە-کانی یان ، یەکی یان بۆمن و ئەوی تریشیان بۆ خۆی ، ئەوەی ڕاستی بێتە خاوەن گەراجەکان لەبەکرێ دان نەبوون بەڵام ئەم زۆڵە بەشاوی ئەوە لەژێر چنگی دەرهێنان گوایا گەنم و جۆیەکی زۆری دوریوەتەوەو جێگای نی یە تێی بکا ، ئەو گەراجانەشی شوێنی باشن بۆ عەمباردانی گەنم و جۆ و فرۆشتنی.رێکەوتنێکی لەگەڵ خاوەن گەراجەکان بۆ ماوەی یەک مانگەو بەکرێی (٥٠٠) دینار بەست ، پێی ووتبووم کەحەقم بەسەر هیچەوە نەبێت ئەگینا هەرزوو دەمووت گەنم و جۆی چی ئێمە بۆ وەکالەتی جگارە هاتووین یان گەنم و جۆ، بەڵام ئارامم گرت و هیچم دەنگم نەکرد هەتا رێکەوتنەکانمان تەواو کردو گەڕاینەوە ، لەگەڕانەوە لێم پرسی بۆ بەکابرای خاوەن گەراجت ووت بۆ عەمبارکردنی گەنم و جۆمانەو نەتووت بۆ پاکەت فرۆشتنمانە ، ووتی ، ئەگەر بۆ ئەوماوە کورتە نەبایە ئەو خاوەنەکەی ئەم گەراجانەی بە دە هەزار دیناریش بەسەر قوفلانە نەئەدەدا ، خۆ ئێمەش هەر تەنیا یەک مانگە ئیشمان پێ یەتی دوای ئەو ماوەیە کلیلەکان دەدەینەوە خاوەنەکەی و کرێ یەکەشمان بۆ دەگەڕێتەوە .

مام محەمەد بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی سەربردەکەی و ووتی:

- منیش ووتم ئەگەر وایە بۆ ئەم گەراجانەت بەکرێ گرت ، دەبا بۆ ئەو ماوە کەمەش هەر نەبوایە ؟ ووتی ، چۆن وا دەڵێی ، ئەگەر ئەم ڕێکەوتنانەمان بەدەستەوە نەبێت مەرجێکە لە مەرجەکانی بەرزکردنەوەی داوای وەرگرتنی وەکالەتەکەمان نا تەواو دەبێتەو سەیری مەعامەلەکەمان ناکەن ، چونکە دوای بەرزکردنەوەی سکالا بۆ کۆمپانیای جگارە و لیژنەیەکە دێتە

تەماشای گەراجەکەو لەبەر ڕۆشنایی ڕووبەرەکەی بڕیار لەسەر دان و نەدانی وەکالەتەکە دەدات .

هەرچەندە زۆر ئیشم هەبوو ، بەڵام لەبەر خۆشی سەربردەکەو نوێ یی ساختەکەی سەعید زەبۆکە هەڵنەستام و گوێ یەکانم بۆ قسەکانی مام مەحەممەد قوڵاخ دا . لەسەرێکەوە پێکەنینم پێی دەهات لەسەرێکی تریشەوە دڵم بۆی دەزوورایەوە . ئەویش بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەی مەسەلەی وەکالەتەکەو ووتی :
دوای ئەو هەموو مەسرەفەو چاوەڕوانی و دوکان داخستنە ، هەموو ماندوو بوونەکەم بەلاش چوو و جەنابیشی وەکالەتەکەی بۆخۆی وەرگرتەو زیکەی چاوەکانی دێنام .

پێکەنینم هات ووتم :
- لەوەندەی گێڕاتەوە هیچ خەتای سەعیدی تیانەبوو ، وەکو خۆت ووتت ، بۆ هەموو شوێنێکە هەر بەیەکەوە دەچوون و بەیەکەوەش مەعامەلەکەتان بۆ کومپانیای جگارە بەرزکردەوە . ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو ووتی :
- هیچ منی نەکوشتووە ئەوە نەبێت ، بۆ هەرکوێ بگێڕمەوە قەرزار- یشم دەکاتەوە !
ڕووی تێ کردم و ووتی :
- دەزانی خەتاکەی چی بوو !؟
ووتم :
- چی بوو ؟
ووتی :
- ئەو ڕیوی یە فێڵبازە هەر لەهەوەڵەوە دەیزانی یەکەوەکیلی- یان دەوێ و دەیدەنە ئەوکەسە کەگەراجەکەی لەهی هەموان گەورەتر بێت . هەر بۆیەش گەراجە گەورەکەی بۆ خۆی داناو بچوکەکەی بۆمن هێشتەوە .
منیش ووتم :

ـ گومانی خراپ مەبە ، بەڵکو ئەویش وەکو تۆ نەیزانی بێ ؟
سەری خۆی لەقاندو ووتی؛ تۆ لەمن باشتر ئەم سەعیدە دەناسی و
دەزانی ماڵێکی چ قەڵپە. سەرۆکی لیژنە پێی ووتم زۆر لەمێژە
بە سەعیدمان ووتووە یەک وەکیلمان دەوێ و دەیدەینە ئەوکەسە
کەگەراجەکەی لەهەمووان گەورەتر بێتە. زۆرم مەراقە بوو بزانم
بۆ ڕێکەوتنەکەی بۆیەکە مانگ بەستە.
لەمام محەممەدم پرسی؛
ـ نەتزانی بۆچی ڕێکەوتنەکەی بۆ یەک مانگ بەستە ؟
بەسەر سوڕمانەوە ووتی؛
ـ ماقوولە تۆ نەزانیتە ؟
ووتم؛
بۆ ماقوول نی یە ! دیارە وەکالەتەکەی هەر بۆیەک مانگ
دەردێنێ ؟
ووتی؛
ـ ئەم هەموو شەرەشەقەی بۆ وەرگرتنی وەکالەتەکەیە، چۆن وابە
ئاسانی وازی لێ دەهێنێ ؟!
ووتم؛
ـ ئەی نەتووت مەرجی سەرەکی بۆ وەکالەتەکە ، گەراجەکەو
ڕێکەوتنەکەیە ؟
ووتی؛
ـ هەر ئەو ڕۆژەی لیژنە لەتەماشای گەراجەکە بوونەوەو بڕیاریان
لەسەر داشی وەکالەتەکە بەسەعید زەبۆکەیکلیلەکاشی داوە
خاوەنەکەی و هیچ شیشی بەگەراجەکە نەما.
بەسەرسوڕمانەوە ووتم؛ ئەی ئەم گەراجەی بۆچی بوو ؟
ووتی؛
ـ تەنیا بۆ بڕیار لەسەردانی لیژنەکە بوو.
ووتم؛

ـ ئەی کە پاکەتەکان وەردەگرێ لەکوێ دایان دەگرێت ؟

بەپێکەنینەوە ووتی!

ـ داگرتنی چی ؟! بۆ دیڵێ بکەوێتە سەر عەرد ، هەر لەسەر پشتی لۆری یەکەوە بەچوارقاتی نرخی خۆی دەیفرۆشێتەوە بازاڕی ڕەش .



# چۆن سەعید زەبۆک مۆڵەتی دوکانەکەی بەڕەسمی وەردەگرێت

مام مەحەمەدی بەختڕەش دیسان بووە نێچیری سەعیدو جارێکی تر وەکو دووپشکە پێ یەوەدا ، ئەوەجارەیان بۆ هەتا هەتایە لەوەرگرتنی مۆڵەتی دوکانەکەی بێ بەش بوو .

کێ بزانێ شارەوانی یاسای نوێی لەبارەی مۆڵەتەدانی دوکانەوە بۆ هاتووەو بەو پێ یە ئەو دوکانەکەی لەناو گەڕەکە نیشتەجێ یەکان کراون وەیان دەکرێن ئەگەر هەندێ مەرجی تایبەتی یان تیا هەبێت مۆڵەتی یان پێ دەدرێت .

قەت سەعید نەبووە ئاوڕ لەدراوسێی خۆی بداتەوە ئەگەر کارێکی پێ نەبووبێت . لەم دوایی یەدا سەعید زیاتر لەجاران پای دەگرتم و لەدوکانەکەی خۆی کێکەو ساردی بەزۆری دەرخوارد دەدام . نەک هەرئەوەندە ، بەم دووایی یە لەوەش پەتی کرد تا گەیشتە ئەوە دوو قووتوو شیری گەورەی بە تۆبزی دامێ و پارەکەشی لێ وەرنەگرتم .

هەرزوو زانیم ئەو ماستە مووێکی تێدایە بەڵام خۆم لەگێلی دا هەتا بزانم چ تۆینێکی تری لەژێر سەر دایە . ترێنەری وەکو خۆی قەت نەبووە ، ئەگەر بیەوێ داوای شتێک وەیان شتێکە لەیەکێکە بکات یان واسیدەی پێ بکات ، حەفتەیەک لەوەوبەر زانیاری یەکی تەواوی لەسەر خۆی و کەس و کارو هاوڕێ کانی کۆ دەکاتەوە . دوای ئەوەش لەهەلێک دەگەڕێ دیاری پێشکەش بکات .

شەوێک بەئیشوکاری دایەرە خەریک بووم ، هەتا درەنگە نەگەڕامەوە ماڵێ . کەهاتمەوە ژنەکەم ووتی :

ـ ئەوە دیسان سەعید چ شتێکی پێتە ؟

ووتم :

ـ بۆ ؟

ووتی؛

- ئەمڕۆ لەنیوەی ڕۆوە هەتا ئێستا زیاتر لەچوار جار هاتووەو؛ لەتۆی پرسیوە.

زمانی خۆمم گەستەوەو لەبیری خۆم ووتم (دیارە خراپ تۆی نەگەیشتوومە ئەم فەرمەسۆنە کارێکی گرینگی پێمە بۆیە هەفتەیەکە دەمم چەور دەکاتەو بەدەورەمدا دەخولێتەوە).

بۆ بەیانی دوای نیوەڕۆ تازە دەستم لەنان خواردن هەڵگرتبوو لەدەرگا درا. سەعید زەبۆک بوو. دوای بەخێرهاتن و چاکی و چۆنی، فایلێکی لەبەردەمم داناو ووتی؛

ماوەیەکی زۆرە خەریکی دەرهێنانی مۆڵەتی دوکانم و هێناومەتە سەر تەواوبوون تەنیا ئیمزایەکی ماوە تەواو بێت، کەچی بەدبەختی بەیانی دەبێ لەبەغدا ئامادەبم بۆ عەمەلیات کردنی قاچم.

ووتم؛

- بۆ قاچت چی یەتی ؟

ووتی؛

- ئەنگوستی گەورەی قاچم ئێسقانی هێناوەو عەمەلیاتی دەکەم. هەرچەندە هیچ ئێسقانم نەدیت ووتم؛

- ئینشاڵا چاک دەبیتەوە. ڕووم تێ کردو ووتم؛

- ئەوجا ئەوە چ پەیوەندی بەمۆڵەتی وەرگرتنی دوکانەوە هەیە ؟!

ووتی؛

- ئەگەر ئەمڕۆ ئەم ئیمزایەم بۆ نەکرێ ئەوا ڕیسم لێ دەبێتەوە خوری، چونکی بەیانی زوو دەبێ لە نەخوشخانە بخەوم وعەمەلیا. تەکە بکەم. خۆشت دەزانی چوون بەدەست مرۆڤەو هاتنەوە لە دەست خۆی نی یە.

نەمزانی مەبەستی چی یە ووتم؛

- جا من چیم لەدەست دێت هەتا بۆتی بکەم ؟

بەپێکەنینەوە ووتی:
- ئیشەکە لەسەر تۆ دەوەستێ ، ئەگەر بتەوێ بۆمی بکەیتە زۆر ئاسانەو هەر ئەورۆ مەیسەر دەبێ . ئەگەریش نەیکەی هەرنابێ.
کەوتمە ئەمری واقیع و ووتم:
- ئەوەی لەدەستم بێ بۆتی دەکەم .
ووتی:
- ئەم ڕووپێوەی کە ناوی لەناو فایلی مەعامەلاتەکە هاتووە و سەرۆکی لیژنەی مولّەتدانی دوکانەکانی ناو گەڕەکە نیشتەجێکانە ...
پێش ئەوەی قسەکانی تەواو بکات ، سەیرێکی ناوەکەم کردو ووتم:
- من ئەو ئافرەتە ناناسم . ووتی:
- دەزانم نایناسی .
ووتم:
- ئەی چۆن یارمەتیت بدەم کەنەیناسم ؟
ووتی:
- ئەو ڕووپێوە برایەکی ئەندازیاری لەدایەرەکەی ئێوەیە .
ووتم:
- کێ یە ؟
ناوەکەی پێ ووتم . سەرم سوڕما ، چۆن من تا ئێستا نەمزانیوە ئەو ڕوپێوەی بەشی مولّەتی بینا خوشکی هاوڕێکەی خۆمە!
ووتم:
- ئێستا چیتە دەوێ ؟
ووتی:
- ئوتۆمۆبیلێکت بۆ دەگرم ، لەگەڵم وەرە مالّی یان و داوای لێ بکە بەلّکو یارمەتیم دەدات و ئەم ئیمزایەم بۆ دەکات .
نەرمانی خوا ڕەزای حەقە !! سواری ئوتۆمۆبیلێکە بووین و چووینە مالّی یان .

ووتم:

- دڵنیای ئەوە ماڵی یانە ؟

ووتی:

- جارێکی تریش هاتوومە . لەزەنگـــی بەردەرگاکەمان دا . ڕوپێوەکە هاتە دەرەوە . هێشتان من قسەم نەکردبوو ، سەعید ڕووی لــە کچەکە کردو ووتی:

- ئەمەش برازاکەمــەو لەگەڵ برا ئەندازی یارەکەی تۆ لەیــەکە دا یــەرە بەیەکەوەن .

موچڕکێکــی سارد لەتۆقی سەرمەوە هەتا ژێر پێم بە لەشمدا هـــات و ئارەقــەی سورو شینم بەدەردا ، لەبیری خۆم ووتم (ئەم قورمساغــە لەهیچــەوە خۆی کردە مامم ، دەترسم پەندێکم پێ بکات !!) .

پیاوێکی بەقەلافــەت ، سەروڕیش سپی لەتەمەنی باوکمە پێم عەیبە نەبوایــە بەدرۆم دەخستەوە بەڵام دانم بەخۆم دا گرت و نقـــەم نەکـرد . کچـەی بەستەزمانیش کەزانی مامەمە زیاتر ڕێــزی لێنــاو بــە ڕێــز لێنانەوە هەردوکمانی کشاندە ژوورەوە . برا ئەندازیار- ەکەی لەمـــاڵەوە بوو ، بەخێرهاتنی کردین و لەجیاتی خوشکەکـــەی بــەو ئێــوارە درەنگە لەگەڵمان هات بۆ پێوانی ڕووبەری دوکانەکەو چۆنێتی گونجانی لەگەڵ مەرجەکانی شارەوانی .

بەپێی تەعلیماتی شارەوانی دەبوایە ڕووبەری تەواوی ئەو دوکانانە لەبیست مەتری چوارگۆشە کەمتر نەبێت و لەپێشەوەی دوکانەکــەش مەترونیوێک بەقوولی دەرگای دووکانەکە لەشۆستەی شەقامەکـــــە بخرێتــە لاوە .

چووینە سەر دوکانەکەی . لە ڕێگا لەناو تاکسی بەکە بیری ئەوەم دەکردەوە باوکی منیش وەکو ئــەو خاوەن دوکانەو تا ئێســـتاش مۆڵەتی دوکانی دەرنەهێناوە . زۆر جـاران سزادراوەو تـــووشـــی دەمەقاڵی بـــووە لەخەڵ چاودێری شارەوانی لەسەر ئەم سەرپێچی- کــردنە . خۆ ئەگەر بمزانیبا ئەم شێشەوا بەئاسانی دەبێـــت

پێش هەموو شتێک مشووری مۆڵەتەکەی باوکیشمم دەخوارد.هەرچەندە لەهاتنم لەگەڵ ئەم کەڵەکە چی یە زۆر پەشیمان بووم بەلام زیانیشم لێ نەکەوت ، بەهۆی ئەم ئاوقاتەوە هەموو مەرجەکانی مۆڵەت دانی دوکانم زانی . لەدڵی خۆم ووتم(لەبەیانی زووتر نی یە مۆڵەتی دوکان دروست کردنەکەی باوکیشم تەواو دەکەم) .
خۆ سەعیدیش نەبوایە ئێستاشی لەگەڵ بێت نەمدەزانی ئەو رووپێوە خوشکی برادەرێکی دڵسوزم دەردەچوێ !!
گەیشتینە سەر دوکانەکەی . هەر وەکو لەوەوپێش وەسفی دوکانەکەیم بۆتان کردبوو ، هەمان دوکانی جاران کەبەناوی کوڵێتە بەشەوو ـ ڕۆژێکە لەترسی مام مەحەمەد و شارەوانی دروستی کرد تەنیا یەک شتی گۆرابوو ، ئەویش گواستنەوەی قەپەنگەکە بوو.
لەپێشەوەی دوکانەکە هەڵگیرابوو و بۆ دواوە بەدووری مەترو نیوێک بەپێی مەرجی شارەوانی گوێزرابۆوە . بەلام لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو ، گوێ یە کۆنەکان کەپێشتر قەپەنگەکەی لەسەر دانیشتبوو هەر لەجێی خۆی لەناو دوو دینگەکە مابۆوە و دوو گوێی تری لەشوێنە نوێ کە چەسپ کردبوو . برادەرە ئەندازیارەکەم پێش هەموو شتێکە دووری نێوان قەپەنگەکەو شۆستەکەی پێواو ووتی:
ـ زۆر باشە تەواوە . مەترو نیوێکی بردۆتە دواوە.
دوایش خەریکی پێوانی ناوەوەی دوکانەکە بوو ، هەرچەندی دەیکرد ڕووبەری ناوەوەی دوکانەکە بیست مەتر دەرنەدەچوو. سەری خۆی لەقاندو ووتی:
ـ وا لەبەر خاتری تۆ دەنگ ناکەم ، ئەگینا مەرجێکی ناتەواوە بەلام لەبەر ئەوەي لەدوورخستنەوەی قەپەنگەکە عەیبی نی یە کە مەرجێکی سەرەکي مۆڵەتی دوکانە و بۆیە بەخوشکم دەڵێم بۆی ئیمزا بکات.
زۆری مەمنون بووم . دوای دانانی برادەرەکەم بەیەکەوە بەتاکسی گەڕاینەوە ماڵێ . لەڕێکا پێم ووت:

- سەعید سەرم لەیەکە شت دەرنەچوو ، تۆ لەدوێنی وە ماڵی ئێمەت بەقونتەراتە گرتووە بۆ ئەم ئیشەو دەشڵێی بۆیە بە پەلەم بەیانی دەبێ لەبەغدا ئامادەبم کەوابوو بۆ ئێمەرۆ هەر لەبەیانی یەوە نەدەچوویتە شارەوانی و ڕووپێوەکەت نەدەهێنا تەماشای ؟ لەقاقای پێکەنینی داو ووتی!

- تۆ پیاوەتی خۆتت کرد ، حەقیتە چی یە بەسەر ئەوە !! ووتم!

- تووسەری خۆت ئەگەر پێم نەڵێی ؟

خۆی لەبیر بردەوەو پێی نەووتم . بیرم لەوەدەکردەوە چ فێڵێکی کردبێت . زورم بیرکردەوە لەدووگوێی قەپەنگەکە زیاتر شکم بۆ هیچ نەچوو . دوو گوێ یە کۆنەکەی قەپەنگەکەم بیرکەوتەوە کەهەر لەناو کۆنکریتی دیکەکانی پێشەوەی دوکانەکەی بەجێ هێشتبوو . پێم ووت!

- سەعید پێت نەووتم ، بۆ دوو گوێ کۆنەکانی قەپەنگەکەت نە گوێزابۆوەو دوو گوێی ترت کڕی بوو ؟

لەقاقای پێکەنینی داو ووتی!

- دۆزیتەوە ... دۆزیتەوە !

بەسەر سوڕمانەوە ووتم!

- چیم دۆزی بەوە ؟

ووتی!

- بەیانی بەلای دوکانەکەمدا وەرە دەزانی .

ئەو شەوەیان هەتا خەوتم هەر بیرم لێ کردەوە نەمزانی مەبەستی چی بوو .

بەیانی بەبەر دەرگای ماڵەوەیان ڕەت بووم ئاوڕێکی لای دوکانە- کەیم دایەوە بینیم قەپەنگەکە لەجێی خۆی نەماوەو گەڕاوەتەوە . پێشەوەی دوکانەکە بۆ سەر گوێ یە کۆنەکانی جاران !!

کەئەمەم دیت شەرمم لەخۆم کردەوە ، خەمی ئەوەم بوو ، خوانەخواستە ڕۆژێکە لەڕۆژان ڕووپێوەکەی خوشکی برادەرەکەم ڕێی بکەوێتە ئەوێ و ئەم دوکانە بەم شێوەیە ببینێ ، چیم پێ

دەڵێ لە هەمووشی ناخۆشتر بەمامی منیش تۆی گەیشتووە .

مەرجێکی تری مۆڵەتی دوکان دروست کردن لەناو گەڕەکەکاندا ئەوەبوو نەدەبوو دووری نێوان دوو دوکان لەسەد مەتر کەمتر بێت بۆیە یەکسەر مام مەحەمەدی بێ بەختم بیرکەوتەوە. زانیم کەچۆن باوکم بەم مەسەلەیەی نەزانیوە ئەوهاش دەستی خۆی پێش مام مەحەمەد خستبۆوەو بۆ هەتاهەتایە لەمۆڵەتی دوکان دروست کردنی بێ بەش کردووە و ئەو دڕکەشی لەژێر پێی دەرهێناوە کە کاتی خۆی لەژێرەوە چاودێری شارەوانی لێ وەئاگا هێناو دوکانەکەی پێشووی پێ هەڵوەشاندەوە .



# هەزار گوناهو یەک تۆبە

ماوەیەک بوو سەعید زەبۆکم وەکو جاران نەدەبینی و گوێ یەکانم بۆ دەنگەو باسی قوڵاخ دابوو بەڵام هیچی نوێم لێ نەزانی . بەلامەوە زۆر سەیر بوو ، ئەگەر دوو حەفتە دوکانەکەی نەکاتەوە یان ناوی لەمەجلیسێکە باس نەکرێت موعجیزەی خوایە . بووە بەردی بن گۆم و سەرو سۆراخی بزر بووە . هەرچەندە کەسمان کەیفمان بەچارەی ئەم ساختەچی یە نارەسەنە نەدەهات بەڵام بە بێ ئەویش بێنمان نەدەهات .

هەر لەمنالی یەوە تامەزرۆی فڕوفێڵەکانی ببوین و سەبوور ـ یمان پێ دەهاتەوە . زیاتر خۆم پێ نەگیرا و بڕیارم دا لەسۆراخی بپرسم . لەگەڵ خەلکی گەڕەکەکەمان کۆبووینەوەو لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین بچینە ماڵی یان و بەسەری بکەینەوە . دراوسێ مافی لەسەر دراوسێ هەیە .

چووینە ماڵی یان ، وا پێ دەچوو سەعید زەبۆک ئەمجارەیان بەڕاستی نەخۆش بێت . بەوەدا دیاربوو خۆی لەژێر دوو لێفەو بەتانی یەک پێچا بۆوەو سەرو ڕیشیشی تێک ئاڵابوو . ڕەنگی زەرد وەکو پەلکە پیازی لێ هاتبوو ، لەدوورەوە تینی گەرمی یەکەی بۆمان دەهات . ناڵە ناڵیشی هەر مەپرسە ، دەتووت منالی ساوایە دەنووزایەوە . لێی نزیک کەوتمەوە . دەستم لەسەر نێوچەوانی دانا وەکو تەنوور سوور هەڵگەڕابوو ، دیاربوو تایەکی قورسی لێ بوو . وەئاگام هێنا ، هەندێک قسەی خۆشم بۆی کردو دڵیم داوە . هەندێک ئاوم پڕژاندە سەر دەم وچاوی و بەزۆری لەژێر نوێنەکەی دەرم هێناو پێم ووت :

ـ گشت دراوسێ یەکان هاتوونەتەلات ، هەندێک وورەت بەرزبێت .

هێزی هێنا بەرخۆی و وەکو جاران دەستی بەقسەی قەڵەو کردەوە.

ڕووی لە ئێمەکردو ووتی:

ـ قەت ئەم دەزانی ، ژیان وەکو چرایەکە هەر بکوژێتەوە دەکوژێتەـ وەو مایەی پووچە ، ئەوەی بەکەڵکی مرۆڤ بێت هەر چاکەو

پیاوەتی یە .
دراوسێ کانی واقیان وڕما ! دەویان بستێک بەش بووە و ڕوویان لەیەک کردو دەستکرا بەپسەپس ، دەبێ ئەمە سەعید زەبۆک بێتە قسەی وا بکات ، باسی ڕۆژی دوایی بکاو لە چاکەو خراپەو پیاوەتی و خێرو خێرخوازی بتۆژێتەوە ؟!
سەعید زەبۆکیش زیاتر لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و ووتی:
ـ تۆبەم کردووە تۆبەی نسوح ، ئەگەر مام و نەمردم هیچی تر بەلای درۆو فێڵ وفرو خراپەدا ناڕۆم و ناوی کەس بەخراپ ناهێنم . نانێکی حەڵاڵ ئەگەر خوا بەقسمەتی کردم ئەوا دەیخۆم ئەگەر نەشی دا ئەوا شوکرانەی دەکەم و چاوم لە ڕزقی حەرام نابێت . هەندەم نەمابوو ئەوجارەیان پەلەواژ ببمەوەو بمرم ، ئەو سامانەی تەمەنێکی دوورو درێژ بەدەردە-سەری کۆم کردبۆوە هیچیم بەکەڵک نەهات .
ڕووی لەئێمەکردو لەپرمەی گریانی داو بەدەم گریانەوە ووتی:
ـ سامانم لەملیونێک ڕەتی کردووە ، هەتا ئێستا فلسێکم زەکاتی لێ دەرنەکردووە ، خۆم بەخەجاڵەت دەزانم بەرامبەر ئێوەو خواو پێغەمبەرم .
هەندێک دڵیمان دایەوەو بە دەستەسڕێک فرمێسکی چاویمان ووشک کردەوەو ووتمان:
ـ کێ بێت لەئێمە لەژیانیدا گوناهی نەکردبێت و دەرحەق بە دراوسێی تەقسیری نەکردبێت . گرینگ ئەوەیە کەپیاو هەڵەی کرد زوو هەستی پێ بکات ڕاستی بکاتەوەو لغاوی شەیتان لە دەمی بکاتەوە . گوتووشی یانە هەزار گوناهو یەک تۆبە . خوا زۆر بەڕەحمە . لەسەر مەرگدا تۆبەی مرۆڤ قەبووڵ دەکات .
سەعید زەبۆک لەگەڵ ئەم قسانەی ئێمە زەوقی کرایەوە ، ڕووی لەئێمە کردو ووتی:
ـ بڕیارم داوە ، ئەگەر لەم نەخوشی یە ڕزگارم ببێتە ئەوا هەموو پیاوو ئافرەتە بەتەمەنەکانی گەڕەکەکەمان لەسەر

حسیبی خۆم ببەم بۆ حەج .
میوانەکان زیاتر حەپەسان و زمانیان بستێک دەرهێنابوو و دەمیان بەش ببۆوە . منیش سەرم سوڕمابوو لەبیری خۆم دەموت (ماقولە ئەمە قسەی سەعید زەبۆک بێتە ؟!).
بووە غەڵبە غەڵبو پسەپس بە یەکی یان دەووت ماقولە سەعید تۆبە بکات . هەندێکی تریشیان دەیانوت ، تۆبەی گورگە مەرگە .
حاجی حوسێنیش تەسبیحەکەی هەڵدەداو بەپێکەنینەوە دەیووت :
ـ ئیبلیسو تۆبەیان نەووتووە .
خۆم بۆ نەگیراو پێم ووت :
ـ سەعید ئەوە بەڕاستیتە ، ئەگەر بمانەوێ ئەمساڵ دەمانبەی بۆ حەج؟
بە پێکەنینەوە ووتی :
ـ من تۆبەم کردووەو شەرتم لەگەڵ خوا کردووە حەجی ئەمساڵتان لەسەر من بێت .
پێم ووت :
ـ هەتا بەچاوی خۆم نەبینم قەت ناچێتە ئەقڵمەوە .
ڕەحمان سەروپێ ڕووی تێ کردو ووتی :
ـ هەر لەئێستاوە ناوی من لای خۆت بنووسە . دوای ئەویش یەک لەدوای یەکە ئەوانی تریش ووتیان :
ناوی ئێمەش بنووسە .
تەنیا حاجی حوسێن نەبێت هیچ دەنگی نەکرد . پێم ووت :
ـ حاجی حوسێن بۆ دەنگ ناکەیت ؟ دیارە ناتەوێ زیارەتەکەت نوێ بکەیتەوە ؟
ووتی :
ـ سوێندەو خواردوومە نەک بۆ حەج ، بۆ بەهەشتیش لەگەڵ سەعید نەچم .

# چۆن سەعید زەبۆک دەبێتە سەرۆک قافلەی حاجیان

کاتی حەج نزیک کەوتەوەو لەهەموو کونجێکی شار لافیتەی گەورە هەڵواسراو سەرۆک قافلەکان بانگەوازیان بۆ ناونووس کردنی ئەوانەی دەیانەوێ بچنە حەج بڵاوکردەوە. پیاوو ژن و پیرو بەتەمەنەکانی گەڕەکەکەشمان لەسەر بەڵێنەکەی سەعید زەبۆک خۆیان بۆ حەج ئامادەکردو وەقدێکیان بۆ ئەم مەبەستە پێکهێناو چوونە لای سەعید. هێشتان باسی چوونە حەج و مەسرەفەکەیان لەگەڵی نەکردبۆوە ، سەعید پێشی لێ گرتنەوەو ووتی:

ـ هەروەکو پارەکە بەڵێنم پێ دابوون ، ئەگەر مەیل بکەن دەتانبەم بۆ حەج .

زیاتر لەسەری ڕۆیشت و ووتی:

ـ هەر لەئێستا زووتر نی یە ئەگەر لاتانە دەفتەری نفوسەکانتانم بدەنێ لەگەڵ جنسی یەی عیراقیو چەند وێنەیەک تاکو ناوتان بخەمە لیستەکەوەو پاسەپۆرتی چوونە حەجتان بۆ دەربهێنم .

ئەوەی لەلاشی نی یە با بەیانی بۆمی بهێنێت .

لەخۆشی یان دەمی یان پڕ ئاو ببوو ، ڕووی تێ کردنەوەو ووتی :

ـ بەخۆتان دەزانن بەپێی تەعلیماتی ئەمساڵ ئەوەی بەتەمەن گەورە نەبێت و یەکەم جاری نەبێت وەیان سێ ساڵ بەسەر حەجی پێشووی ڕەت نەبوو بێت ئەوا دەوڵەت ماوەی چوونە حەجی نادات ئەگینا من حەزم دەکرد ، سەرتاپای خەڵکی گەڕەکەکەمان لەگەڵ خۆم ببەم بۆ حەج .

حاجی حوسێن پانزە ساڵ لەمەوبەر حەجی کردبوو ، تۆزێک شارەزایی لەبارەی چوونە حەجەوە پەیدا کردبوو بۆیە هەر لە هەوەڵەوە فشەی بە بەڵێنەکەی سەعید زەبۆک دەهات و بە خەڵکەکەی دەووت :

ـ کاتی خۆی کەمن و حاجی عەیشۆی ژنم چووینە حەج مانگێک پێشتر بەدوای سەرۆک قافلە گەڕاین هەتا سەرۆک قافلەیەکمان

دەست کەوت . جونی بەتاڵی لە لیستەکەیدا مابۆوەو ناوی ئێمەی لای خۆی نووسی و پێشەکیش پارەی چوون و هاتنی ڕێگای لێ وەرگرتین .

پەنجەی بۆ سەعید درێژکردو وتی:

ـ ئەم سەعیدە هەر ئەوەندە بەسالێکە هاتووەو جۆ بەدیوار هەڵدەگەڕێنی ، ئەم فەرمەسۆخە نە نوێژ دەکاتەو نە ڕۆژی دەگرێ ، هەتا ڕێی خراپ هەبێ ڕێی چاکە ناگرێ . چۆن دەچێتە ئەقڵەوە لەسەر حسێبی خۆی خەڵک بۆ حەج ببات . سەری خۆی لەقاندو لەبەرخۆیەوە وتی (ئەم ماستە مویکی تیایە!) ڕەحمان سەروێ و رەفیقی چایەچیش دوو ڕۆژ بوو دەفتەری نفووس و جنسی یەی عیراقی یان دابوویە . بۆیە بەپێکەنینەوە وتیان :

ـ ئێمە چمان زەرەر کردووە ، وا خۆمان لەلای ئاونوس کردووە ئەگەر بەڵێنەکەی بەجێ هێنا چاکەو چێتر ئەگەریش درۆی کرد خوا ڕووی ڕەش بکات . ئەم ساڵ نا ساڵێکی تر لەسەر حسێبی خۆمان دەچینە حەج .

کاتی چوونە حەج نزیک کەوتەوەو پەیتا پەیتا قافڵەی حاجیان کەوتنەڕێ . ڕۆژێک دەچوومە بازار بینیم سەعید زەبۆکە قاتێک جلی کوردی نوێی لەبەرکردووەو لەدوکانەکەی دانیشتبوو و کۆمە-ڵێک فایلیشی لەسەر مێزەکەی داناوەو پیرو بەتەمەنەکانی گەڕەکەکەمانی لەدەوروەی خۆی کۆ کردوونەتەوەو فەتوای بۆ دەدان . دەیوت :

ـ بەخۆتان دەزانن من لەسەر حسێبی خۆم دەتانبەم بۆ حەج و پارەی هەردوو سەریشتان بۆ دەدەم . هیچم لەئێوە ناوێت تەنیا ئەوە نەبێت ئێوەش یارمەتیم بدەن و لەکاتی گەڕانەوە هیچ شتی زیاد لەگەڵ خۆتان مەهێنن .

هەموویان سەری خۆیان لەقاندو وتی یان:

ـ ئەشهەدوبیلا قسەیەکی جوانە . ئێمە چمان دەوێ لە زیارەتەکە بەولاوە . جا لەوە باشتر هەیە زیارەتی خۆمان بکەین و

ئەسپێکیشمان نەچێت ؟! ئەوەی بۆ ئێمە ڕێک کەوتووە بۆ کەس ڕێک نەکەوتووە .
سەعیدیش خۆی قیت کردبۆوە دەتووت سەرەپیاوی ئاو پیاوانە بەردەوام بوو لەقسەکانی و ووتی:
- برایینە ڕەنگە بێتە ئێوە نارەزایی تان لەسەر مەکەو مەدینە نەبێت . بەوە نی یە ئەوێ ماڵی خوایە ! ئەوێ لێرە زیاتر پیاوی خراپ و قوڵبڕی کارامەی تیایە ، گیرفانی ئەو خەڵکە وا بەپسپۆری دەبڕنەوە ، هەتا دەست بۆ باخەڵی یان نەبەنەوە نازانن .
بۆیە تکاتان لێ دەکەم ، بایی خۆتان زیاتر پارە لەگەڵ خۆتان مەهێنن . دوایی ئوباری خۆتان بەملی خۆتان . مەڵێن سەعید پێی نەووتووینە ؟
دیسان بووە پچە پسو خەڵکەکە ڕوویان لەیەک کردەوەو بە یەکی یان ووت :
- ئەشەدوبیلا تەواوە ، خۆ هار نەبووینە پارەی زیاد لەگەڵ خومان هەڵگرین .
سەعیدش لانسی لەقسەکردن وەرگرتبوو دیووت :
- شتێکی تریش هەیە دەمەوێ پێتان بڵێم . ئیش لەم سەرەوە خۆشە نەک لەوسەر . لەکاتی گەڕانەوە ڕازی نیمە کەس هیچ شت لەگەڵ خۆی بهێنێتەوە لەهەندێ تەسبیم و دیاری بچوک بترازێ .
بەیەکەدەنگ هەموویان قسەکەیان پەسەند کردو ووتیان:
- ئەشەدو حەقی خۆتە ، بۆ باری ئوتوموبیلەکە قورس بێت !!
چەند ڕۆژێکی نەبرد ، بەلای ماڵی سەعید دەهاتمە خوارێ و بینیم لۆری یەکی گەورەو پیکەپێکی دوو تەنی و مونشەئایەک لەبەر دەرگای ماڵی سەعید ڕاوەستابوو و لافیتەیەکی گەورەش بەپێشەوەی مونشەئایەکە کرابوو بەخەتێکی گەورە لەسەری نوسرابوو حەجێکی پیرۆز لەژێرەوەشی نووسرابوو سەرۆکە قافلە سەعید .
خەڵکی گەڕەکیش ئەوانەی خۆیان لەلای ناونووس کردبوو، خەریکی

ڕێکخستنی کەل و پەلەکانی یان بوون و داخە دڵنە دەچوونە سەیار
مونشەئا یەکە . کەسەیری مونشەئا یەکەم دەکردو لافیتەی پێشەوەیم
دەخوێندەوە پێکەنینم دەهات . ڕابردووی پڕ لە ساختەو فێڵ و
فڕو تەڵەکەبازی و درۆو دەلەسەکانی سەعیدم دەهاتنەوە یـــادو
لەبیری خۆم دەمووتە (سەعیدو سەرۆکە قافڵەی حەج کـوجـــا
مەرحەبا !! ئەم ڕیوی یە فێڵبازەو چوونە حەجی یان نەوتووە) .
ئەو ڕۆژەیان سەعید زەبۆکە زۆر مشاوەشاو ماندوو دیار بـوو .
بەخێرایی لەناو حەوشەی ماڵەوەیان دەهاتەو دەچوو. منداڵەکانیش
خستبووە کار . وەکـو مێروولە سەری یان لەدوای یەک نابوو و
لەژوورەوە تـا دەگاتە لۆری یەکە کارتۆن لەدوای کارتۆن لـــە
ژوورەوە دەریان دەهێناو لەپشتەوەی لۆری یەکە لەسەر یـــەک
سەفتەیان دەکـــرد . هەرچەندی بیرم لێ کردەوە لـەمـەبەســـتی
نەگەیشتم . خۆم گەیاندە لای و پێم وت :

ـ ئەم کارتونانە چـین ؟

ووتی:

ـ مورەبای قەیسـین .

ووتم :

ـ چی لێ دەکەی . حەج و مورەبایان نەوتووە ، خوانەخواستە خـــۆ
بازرگانیشـی پێوە ناکەیت ؟!

ووتی:

ـ ئەی بەچـی سەرۆکە قافڵەم ؟! ئێمـە بە بیابانێکی وەهـــــادا
دەڕۆیـن لەتۆزو خـۆڵ بەولاوە هیچـی تری لێ نی یە بیخـۆیـــن .
ئەم مورەبایانەم بۆ خۆراکـی ڕێگایە . ئەوەی برسـی ببێتە بـــا
هـەر مورەبا بخـوات هەتا خـوا دەڵێ بەس !
هەندێک بیرم کردەوە نەمزانی بڵێم چی !

# گەڕانەوەی قافڵەی حاجی سەعید

چەژنی قوربان تەواو بوو ، دانە دانە کەشیدەی شوێ بەسەری حاجی یەکان دەبریقاوەو پەیتا پەیتا قافڵەی حاجیان دەهاتنەوە بەردەم تەکیەی شێخ عبدالکریم وەکو فڕۆکەخانەی لێ هاتبوو ئەوەی کەسوکاری و باوکەو دایکەو خوشکەو برای بۆ حەج چوو بوو لەوێ چاوەڕوانی یان دەکردو لەدەورەی ئەو حاجیانە کۆ دەبوونەوە کە دەگەیشتنەجێ و لەسەرو سۆراخی یان دەپرسین . ئێوارە گەڕامەوە ماڵێ ، بینیم قافڵەکەی حاجی سەعیدیش هاتۆتەوەو ڕەحمان سەروپێ و ڕەفیقی چایەچی و مام مەحەمەدو دراوسێ کانی تریشم بەکەشیدەی زەردەوە بینی خەریکی هێنانە خوارەوەی کەل و پەلەکانی یان بوون .

چوومە لایان و باوەشمان بەیەکدا کردو تێروپڕ یەکتریمان ماچ کرد ، بەخێرهاتنەوەم لێ کردن و پیرۆزبایی حەجەکەم لێ کردن .

پێم ووتن!

ـ لەوباوەڕەدا نەبووم سەعید بتانگەیەنێتە حەج ؟! لە دڵی خۆم دەموت لەوانەبێت لەڕێگای عەرعەر بتانگەڕێنێتەوە !

حاجی ڕەفیقی چایەچی پێکەنی و ووتی!

ـ وای لێ نەکردین بەس سەد خۆزگە هەر لەوێ بی گەڕاندباینەوە

ووتم!

ـ بۆ ؟

دیار بوو هەموویان لێی لالووت بوون ، بەچاوی ڕقەوە سەیری یان دەکرد . ئەویش خۆی مۆن کردبۆوەو نقەی لێوە نەدەهات .

حاجی سەعید کوڕەکانی بەسەر لۆری خستبوو ، هەر خەریکی داگرتنی کارتۆن بوون و دەیان بردە ژوورەوە . سەیرێکی لۆری یەکەم کرد هەتا سەر دەرکەو لێوان پڕ بوو لەکارتۆنی گەورەو مافورو وەرتەو کەل و پەلی گران بەها ، هەر هەمووشی یان بۆ

مالّی حاجی سەعید گواستەوە.

بەکالّتە بەرەفیقی چا یەچیم ووت:

ـ ئەوە چی یە ، حاجی سەعید وەکالەتی هێنانی کەل وپەلی وەرگرتووە ؟! بەپێکەنینەوە ووتی:

ـ هەر لەوە دەپرسی ؟! مەگەر سەعید زەبۆک نەبێت !! ئێستا چۆن ئەم لۆری یەی بەپڕی هێناوەتەوە ئەوهاش بەپڕی کۆنە مورەبای دوکانەکانی هەولێری کۆکردبۆوەو بەئێمەو حاجی یەکانی مەکەو مەدینەی ساغ کردنەوە. خۆزگا گوم بخواردبا لەگەلّ ئەم ئبلیسە نەچووبام !!

زۆر سەیرّ بەکلەیی یەکەی هات ووتم:

ـ تۆ هیچ زەرەرت کردووە ؟ بەس نی یە لەسەر حسێبی خۆی ئێوەی بردە حەج ، لەوە زیاتر چیتان دەوێ ؟

ووتی:

ـ ئەم فەرمەسۆنە بازرگانیی بە ئێمەوە کردبوو بەلاّم ئێمە خەشیم بووین و نەمانزانی !

ووتم:

ـ چۆن ؟

ووتی:

ـ ئەمسالّ مەرجەکانی چوونە حەج زۆر قورس تر بوون لەمەرجەکانی سالّی پێشوو لەسەوی یەکی نەدەگرتەوە. هەر بۆیەش بوو ئەو عفریتە هەر لەسەوتاوە تەنیا بەلّێنی بەپیرو تەمەن درێژەکان داو هیچ بەلای جاحێلّەکانەوە نەچوو. ئەوەبوو بە واسیتەی ئێمە خۆی کردە سەرۆکی قافلّە.

ووتم: ئەوجا چی یە ؟ بۆ نەی دەتوانی بەبۆی ئێوەش بچێتە حەج ؟

ووتی:

ـ وا دەزانی ئەو بۆ زیارەتەکە هاتبوو ؟

ووتم:

- ئەی بۆچی هاتبوو ؟

ووتی:

- بۆ کەسابەت و بازرگانی و قاچاخ چێتی .

ووتم:

- چۆن ؟

ووتی:

- سەرۆک قافڵە ڕێگای پێ دراوە پیکەپێک بەتەنیا بۆ خۆی تەرخان بکات .

ووتم:

- ئەوجا چی یە ؟

ووتی:

- چۆن چی یە ؟ ئەو پیکەمە پڕ لە کەل وپەلی گران بەها دەکات و لێرە بازرگانی پێوە دەکات و بەچوار نرخی خۆی دەیفرۆشێتەوە .

ووتم:

- چی تر ؟

ووتی:

لەبیرتە کە ئامۆژگاری ئێمەی دەکردو دەیووت ، پارەی زیاد لەگەڵ خۆتان مەبەن نەوەکو لێتان بدزن ؟

ووتم:

- زۆر باشم لەبیرە . بۆ قسەکەی ئەو وادەرتەچوو ؟

ووتی:

- ئەگەر پارەی زیادمان لەلا بوایە ، هەندێک شتی بەنرخمان لەوێ دەکڕی و ئێستا بەنرخێکی باشمان دەدایەوە . بەڵام لەبەر ئەوەی پارەیەکی باشمان لەلانەبوو ، هەرچی دەستمان بۆی دەبورد ، پێمان نەدەکرا ، ئەویش پارەیەکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنابوو ، یەکە لۆری گەورەی لەو شتە بەنرخانە داگرتە و

لەشوێنی پشکنینی سەر سنووریش لەسەفوان هەر شتەی بە ناوی یەکێکمان ناونا . فلسێک چی یە پارەی گومرگی نەدا . ئێمەش زیکەی چاومان دەهات و هەر لەرێکاوە تاکو ئێرە هەر ئەنگوستی خۆمانمان دەگەستەوەو ئاهی ساردمان هەڵدەکێشا .

ووتم :

ـ باشە سەر هیچ پارەتان لەگەڵ خۆتان نەبردبوو ؟

ووتی :

ـ هەندێکمان لەگەڵ خۆمان بردبوو بەلام پێش ئەوەی بکەینەجێ بەو مورەبا بۆگەنی یەی کە هێنابووی زۆربەی لەباخەڵ دەرهێناین و کەمی پێ هێشتینەوە .

ووتم :

ـ ئاکاتە هەموو کارتۆنە مورەبا یەکانی بەئێوە ساغ کردبێتەوە ؟
لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :

ـ بەرەوەڵا بەئێمەو حاجی یەکانی قافڵەکانی تر ساغی کردەوە . بەبەردێکە دوو چۆلەکەی کوشت !!

کە رۆیشتین بۆ حەج وای تێ گەیاندین کە ئەو مورەبایەی بۆ ئێمە هێناوەو لەبیابان دەمانداتێ ، هەر بەو فێڵەش خۆی لەگومرگەکە رزگار کردو لەجیاتی ئەوەی گومرگی لێ بستێنن . کەلە جێگای پشکنینەکە دوور کەوتینەوە گشتی بە چوار قاتە پێ فرۆشتینەوە . بەمەش توانی پارەیەکی زۆر بە دەست بهێنێ بۆ کرینی کەل وپەل ، خۆ ئەگەر بەم فێڵە نە بوایە نەیدەتوانی ئەم هەموو پارەزۆرەش لەگەڵ خۆی بهێنێ . چونکە زۆر لەبڕی رێگا پێدراوی یاسا زیاتر بوو .

من و حاجی رەفیق مەشغوڵی گێرانەوەی ئەم سەربردانە بووین لەناکاو دەنگی حاجی رەحمان و مام محەمەد بەرزبۆوە .

کەئاوڕم لێ بان دابەوە ببینیم لەگەڵ حاجی سەعید یاخەی

کرتـــووەو بەکـــژ یەکدا دەچـن .

حاجی ڕەحمان دەیووت :

ـ غەمبالەی خۆمـەو هەر ئێستا دەی بەمەوە. حاجی سەعیدییش دەی ووت :

ـ تۆزێکە ئارامم لێ بگرە ، هەندێکە مافی منی تیایە بەیانی بۆتی دەنێرمەوە .

لێ یان نزیکە کەوتمەوە حاجی ڕەحمان ڕووی لەمن کردو ووتی:

ـ توخوا حەقی منە یان نا ؟

نەک من بەهەرکۆی بڵێن حەقی حاجی ڕەحمان دەگرێت !

ووتم :

ـ بێ گومان حەقی تۆیە .

حاجی سەعیدیش دەستی لەسەر کەشیدەکەی دانابوو ، هەزار سوێند بەعانەیەکە . هەر دەیووت و دەیووتەوە ، بەو حەجەی تەواقم کردووە مافی منی تیایەو بەیانی دەیدەمەوە .

حاجی ڕەحمانیش سوورو شین هەڵگەرابوو ، ئەوەندە توڕەو توونـد ببوو لەتاوان وەکو بورکان هەڵدەچوو پڕ بەدەنگ هـــاواری دەکـــردو دەیووت :

ـ ئەتوو وەرە بەپارەی خۆت شتە بکڕیت و بە بارەباڕ بە زیندوی چاوان لێتی زەوت بکەن ! ڕووی لەئێمە کردو ووتی:

ـ برایان ئێوە شایەت بن ، با پێشانمان بدات ، بزانین مافی چی ئەوی تیایە . لەسەر دەستی ئێوە دەنگ نەکەم و ئەم

. غەمبالەیەشم لەخوا گەرەکەو با بۆخۆی بێتە .

هەموو بەیەک دەنگ ووتیان:

ـ ئەئەدو قسەیەکی جوانە . لەحاجی سەعید چوومە پێشەوەو دەستم خستە سەر شانی و پێم ووت :

ـ کەس نەتناسێ من زۆر چاک دەتناسم ! دەزانم ئەمەش شوێنێکی تری تیایە ، بۆی ناوێ ئەم بەستەزمانە هیچی تر

ماندوو بکەیتەو ئەگەر دەزانی هی خۆیەتی بیدەوەو هیچی تر تەشقەڵەی پێ مەکە. ئەگەر دڵنیاشی هی خۆتە بی سەلمێنە .
ئەگەر فێڵ و فریشت تیای کردووە فەرموو لەبەر چاوی ئێمە ساغی بکەوە ؟!
حاجی سەعید زۆر دوو دڵ بوو ، نەیدەزانی چی بڵێ . وەکو بڵێی نهێنی یەکی زۆر گەورەی لەناو هەشار دابێت بۆیە نەی دەویست لەبەر چاوی ئێمە ئاشکرای بکات .
ئەوەی ڕاستی بێت منیش لەحاجی ڕەحمان بە پەلەتربوو بۆ زانینی ئەو نهێنی یەو هەرچەندی دەم کرد نەم دەزانی مەسەلە چی یەو مەبەستی سەعید لەومافە چی یە.
بۆیە هەموو لایەک تەنگمان پێی هەڵ چنی و ناچارمان کرد کە دەست لەسەر غەسالەکە هەڵبگرێتەو واز لەحاجی ڕەحمان بهێنی و بیداتەوە ، وەیان لەبەرچاوی ئێمە مافی خۆی لەناو هەڵگرێتەوە. حاجی سەعید دەتووت لەسەر کەریان گرتووە وا بەشەرمەوە بەخۆی و پلایس‌و دەرنافیس کەوتە سەر کردنەوەی دیوی دواوەی غەسالەکەو جیهازیکی ڤیدیۆی ناشیونالی لەناو دەرهێناو ووتی!
ـ ئەم ڤیدیویە هی منە .
هەموو حاجی یەکان چاویان ئەبڵەق بوو. حاجی ڕەحمانیش سەری خۆی لەقاندو ووتی!
ـ نەعلەت لەشەیتانتدا سەعید لەگەڵ خۆت و کردەوەت !! ئەو کلاوەشتە لەسەرم ناوەو بەخۆشم نەزانیوە ؟ هەزار سوێندم لای ئەفسەری گومرک خوارد کەهیچی تیا نی یە چیم بەخۆم دەووت ئەگەر تەماشای ناوەوەی بکردبا ؟!
بەم جۆرە ساختەو فڕوفێڵەکانی سەعید زەبڵاکە نە سەری یان هەبوو ونەبن . ساڵ کەسێ سەدو شەستەو پێنج یان شەش ڕۆژە ئەگەر بەدرێژایی ئەو هەموو ڕۆژانە باسی ئاین و ئایین و

کەڵەکاتەکانی سەعید زەبۆکتان بۆ بکەم هێشتان هەر مشتێکە لە خەرواری ·

کەسەعید تۆبەی کردو ڕووی لەماڵی خوا کرد زۆر کەیف سازبووم لەدڵی خۆم وتم (ئەوەندەش هەر باشە، فلیمی ئەفعالە خەبیسەکانی ئەو ئیبلیسە لێرەدا کۆتایی پێ بێت) کەچی نەمزانی چوونە حەج لە لای ئەو فەرمەسۆنە بڕوانامەی دکتۆرایە لەتەڵەکەبازی و درۆزنی و بێ ویژدانی و بێ وەفایی و بێ شەرەفی دا . هەزار خۆزگە بەو کاتەی کە سەعید زەبۆکی هەر لەو ڕۆژەوەی کەشیدەی زەردی لەسەرنا، هەزار سوێند بەعانەیەکی لەجیاتی سوێند بەتەلاقەو بە شەرەفی بخوات، دەستی لەسەر کەشیدەکەی دادەناو سوێندی بەو حەجە دەخوارد کەتەوافی کردبوو ·

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی نووسەر:

* شەش کورتە چیرۆکی کوردی ـ 1976 ـ بەهاوبەش لەگەڵ چیرۆک نووس سابیر ڕەشید .
* وون بوون ـ 1984 ـ چیرۆک .
* دەرگا ـ 1990 ـ چیرۆک .
* سەعید زەبۆکی لای خۆمان ـ 1991 ـ ڕۆمان .
* لێک دانەوەی یاسای بەکرێدان ـ 1991 ـ .
* سایکۆلۆژیای هونەری منداڵان ـ 1991 ـ .

## لەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن:

١ـ بکری پەشیانی نەکری پەشیانی ـ کۆمەلە چیرۆک ـ ١٩٩١.
٢ـ ڕۆمانی ئاو ـ١٩٩١

بۆمانی حزبی پڵاو ـ ١٩٩٦



## نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

١ـ لەساڵی ١٩٥٦ لەشاری هەولێر لەدایك بووە.
٢ـ لەساڵی ١٩٧٦ بۆ یەکەمین جار لەئەمینداریتی ی شارەوانی و هاوینەهەوارەکان دامەزراوە.
٣ـ لەساڵی ١٩٩٠ خانەنشین بووە.
٤ـ لەساڵی ١٩٩٦ لەکۆلێژی یاساو رامیاری لەزانکۆی سەلاحەدین بەناونیشانی مامۆستای یاریدەدەر دامەزراوەتەوە .
٥ـ لەساڵی ١٩٨٩/١٩٨٨ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەیاسا وەرگرتووە.
٦ـ لەساڵی ١٩٩٦ بڕوانامەی ماجستێری لەیاسای شارستانی لەنامەی (مافی موڵکداریتی ی ئەدەبی و هونەری لەیاسای عیراقی و بەراووردا) بەپلەی زۆرباشە وەرگرتووە.
٧ـ خولیای ئەدەب و هونەری شێوەکارەو لەبواری رۆژنامەگەریشدا کاری کردووە. سەرنووسەری رۆژنامەی پارێزگاران و رۆژنامەی سەربەخۆیی بووەو ئێستاش ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی هەرێمی کوردستانە.


**مۆنتێف:**

**دارا محمد علی**

**نرخی (١٠) دینارە**

**چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری**

# ئەم رۆمانە

لەکۆمەڵگای کوردەواری ئێمەدا، برایم زەبۆکی (عەزیز نەسین) ئاسامان زۆرن، بەڵام کامە ئەڵەمی بەبڕشتی گاڵتە ئامێز خۆی لەڤەرەی ئەو تەرزە بابەتانە هەڵسوبوە.

(کەمال سەعدی) خۆمان لەبەرهەمەکانی لەمەوبەرێشی چ لەناوەرۆکو چ لەهەڵبژاردنی بابەت و ناوونیشانەکانیدا خوازیاری ئەم جۆرە ئەدەب و شێوازە دەربڕینە بووە، هەر بۆیەش بەگشتی هەستی بەم کێشە قوڵانەی ناو کۆمەڵگای کوردەواری کردووەو بەتێڕوانینی من سەرکەوتوانە لەرۆمانی (سەعید زەبۆکی لای خۆمان) ڕەنگ و دەنگی داوەتەوەو دوور لەلاسایی کردنەوەو خۆ پێوە هەڵواسین و ڕەچاوکردنی ئەدەبی (نەسینانە).

وادەزانم ئەدەبی گاڵتەجاڕی لکێکی هەرە گرنگی دەربڕینی ئێش و ئازارو ژان و دەردەسەرییەکانی نەتەوەکەمانە. خۆ لەیەیەککگرتنی هەڵس وکەوتی برایم زەبۆک و سەعید زەبۆک دڵنیام و بەڕاشکاویەوە دەڵێم کەلەکەچیاتی و قۆڵبڕی و چاوچنۆکی و ساختەچیاتی و هەڵپەرستی و لەخشتەبردن بۆ گەیشتن بەمەرامە تایبەتیەکان زەبۆکی کەمال سەعدی سەد بەردی بەزەبۆکی نەسین داداوەو ئەوەی ئەمیان بەحەفت ئاوان شوراوەتەوەو فەرموو تۆش بیخوێنەوە؟!

**سابیر ڕەشید**

SAHID
ZABOK

KURDISH
NOVEL

*BY*

The novelist
Kamal Saadi

Erbil-1997


هەولێر – ١٩٩٧

ژمارەی سپاردنی بەکتێبخانەی نیشتمانیی کوردستان ١٧٨ ساڵی ١٩٩٧

سەرپەرشتی چاپ
سەعد شکاک